ناوی کتێب: خۆشی پیشەی من نییە
نووسینی: محەمەد ئەلماغوت
وەرگێڕانی: حسێن لەتیف - کارزان عەلی
بابەت: شیعر
مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولرەحمان فەرەج
هەڵەچنی: مهاباد رەحیم - سازان قادر
تیراژ: ٦٠٠ دانە
نرخ: ١٢٥٠دینار
ژمارەی سپاردن: ٢٥٤٨ ی ٢٠٠٨
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپی : یەکەم ساڵی ٢٠٠٩
کوردستان -سلێمانی
www.sardam.net
www.sardam.info
www.sardam.org

سەرچاوە:
محمد الماغوط
الفرح ليس مهنتي
دار المدى للثقافة والنشر/ ٢٠٠٦

# ماغوت له چەند دێڕێكدا:

ساڵی ١٩٣٤ له شاری سلمیەی سەر بە پارێزگای حەما له سووریا له دایكبووه.

بە یەكێك له پێشەنگەكانی شیعری پەخشان ئامێز دادەنرێت له نیشتمانی عەرەبیدا .

شاعیری كۆچكردوو"سنیه صالح"خێزانی بووه، و دوو كچیان هەبووه "شام" كه پزیشكه و "سلافه"ش دەرچووی كۆلێژی هونەره جوانەكانه له دیمەشق.

ماغوت بە یەكێك لەو گەوره نووسەرانه دادەنرێت كه بەشداریكردووه له دیاریكردنی شوناس و سروشت و ئاراستەكردنی گۆڤاری "تشرین"ی سووری دا. وه رۆڵی گرنگی هەبووه له پێگەشتن و دەرچوون و گەشەكردنیدا،كاتێك به نۆره لەگەڵ چیرۆكنووس زەكەریا تامردا گۆشەیەكی رۆژانەیان دەنووسی.بەم شێوەیەش بەردەوام بوو تا ساڵی ١٩٧٥ و دواتریش.

پاشان ماغوت له گۆڤاری"ئاینده"دا زنجیرەی "الیس فی البلاد العجائب"ی دەنووسی. وه رۆڵێكی بەرچاویشی هەبوو له بڵاوبوونەوەی "ئاینده" و گەشەكردنیدا له سووریا.

گرنگترین بەرهەمەكانی:

١. خەمێك له ژێر تریفەی مانگدا –شیعر(دار مجلة الشعر –بیروت ١٩٥٩)

٢. ژوورێك به ملیۆنێك دیوارەوه-شیعر (دار مجلة الشعر-بیروت ١٩٦٠)

٠٣ چۆلەکەی قەموور-شانۆیی-١٩٦٠(پێشکەش نەکراوە)
٠٤ گاڵتە جار – شانۆیی-پێشکەش کراوە لە ساڵی ١٩٦٠ ،وە ساڵی ١٩٥٩ لەلایەن (دار المدى-)لە دیمەشق چاپکراوە٠
٠٥ خۆشبەختی کاری من نییە-شیعر (بڵاوکراوەی یەکێتی نووسەرانی عەرەب-دیمەشق ١٩٧٠)٠
٠٦ خەسارۆمەندی تشرین-شانۆیی(چاپ نەکراوە-ساڵی ١٩٧٣ و ١٩٧٤ پێشکەش کراوە)٠
٠٧ دەستە گوڵی بەهەشت-شانۆیی٠
٠٨ جۆلانێ-ڕۆمان ١٩٧٤(ساڵی ١٩٧٤ و ١٩٩١ لە دار الرياچ الريس چاپکراوە)٠
٠٩ غوربەت-شانۆیی(چاپ نەکراوە،ساڵی ١٩٧٦ پێشکەش کراوە)٠
٠١٠ پەرداخەکەت ئەی نیشتیمان-شانۆیی(چاپ نەکراوە،ساڵی ١٩٧٩ پێشکەش کراوە)٠
٠١١ لە دەرەوەی ڕەوە باڵندە-شانۆیی (دار المدى-دیمەشق ١٩٩٩، پێشکەش کراوە لە دەرهێنانی جهاد سعد)٠
٠١٢ چیرۆکەکانی شەو-زنجیرەی تەلەفیزیۆنی (لە بەرهەمهێنانی کەناڵی سوریا)٠
٠١٣ هەڵە لە کوێدایە- زنجیرەی تەلەفیزیۆنی (لە بەرهەمهێنانی کەناڵی سوریا)٠
٠١٤ دۆڵی میسك- زنجیرەی تەلەفیزیۆنی٠
٠١٥ چیرۆکەکانی شەو- زنجیرەی تەلەفیزیۆنی٠
٠١٦ سنوور-فلیمی سینەمایی(بەرهەمهێنانی ڕێکخراوی گشتی سینەمای سووریا،نواندنی دورەید لەحام)٠
٠١٧ ڕاپۆرت- فلیمی سینەمایی(بەرهەمهێنانی ڕێکخراوی گشتی

سینەمای سووریا،نواندنی دورەید لەحام).
١٨. خیانەت لە نیشتمانەکەم ئەکەم-کۆمەڵە وتار ( ١٩٨٧ و ٢٠٠١ چاپکراوە).
١٩. جەللادی گوڵەکان — دەق (دار المدی) لە دیمەشق.
وە کۆی بەرهەمەکانی لە لایەن (دار العودە)ەوە لە لوبنان چاپ و بڵاو کراوەتەوە.
هەروەها لە لایەن (دار المدی)وە ساڵی ١٩٩٨ دووبارە کۆی بەرهەمەکانی چاپکراوەتەوە بە ناونیشانی (کۆی بەرهەمەکانی محمد ماغوت) و ئەم بەرهەمانەی لە خۆ گرتووە ( کۆمەڵە شیعرییەکانی: خەمێك لە ژێر ڕۆشنایی مانگ دا ، خۆشبەختی کاری من نییە، ژوورێك بە ملیۆنێك دیوارەوە)، وە هەردوو شانۆیی: چۆلەکەی قەموور ، گاڵتە جاڕ)، لەگەڵ ڕۆمانی : جۆلانێ) .
*هەڵبژاردە و دیوانە شیعرییەکانی وەرگێڕراون و لە چەندین وڵاتدا بڵاو کراونەتەوە سەرەڕای چەندین لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی و ماستەری زانکۆ لە سەر شیعر و شانۆییەکانی.
وە لە ٢٠٠٦/٤/٣ دا کۆچی دوایی کردووە.

## محمد ماغوت.... گاڵتە کردن لوتکەی ئازارە:

لە رۆژێکی ساردی زستاندا ماغوت لە شاری سلمیەی سەر بە پارێزگای حەما لە شوباتی ساڵی ١٩٣٤ لە سوریا لە دایکبووە،وە هەروەکو زۆربەی هەژارەکانی ئەو رۆژگارە نەیتوانیوە هیچ بروانامەیەکی زانستی بەدەست بهێنێ، لەبەر ئەوە تەمەنی منداڵی بە نەگبەتی و بێبەش بوون بەسەر بردووە و دواتر بە خوێندنەوە و گەران بە دوای میکانیزمێکدا یاخیبووە بۆ رووبەرووبونەوەی ئەو ستەمە،لەوانەشە ئەو میکانیزمەی تەنها "وشە"بێت کە دۆزیویەتەوە و ئەو رێگەیەی بۆ خۆشکردووە بۆ چاندنی دار و درەختی بەرز و بڵند لە لاکانییەوە،شیعر و شانۆیی ئەو وشەیە بوون هەروەك (سنیە صاڵحی) خێزانی دەڵێ،ئەگەر ئەو شتانە لە خەونیدا رێگەیەك بووبن بەرەو ئازادی،ئەوا لە ژیانی واقیعدا رێگەیەکن بەرەو زیندان،لەبەر ئەمەش ماغوت هەر زوو دیواری زیندانی ناسی، و لە پشت شیشەکانییەوە دەقەکانی بە تەنهایی دادەرشت و بوو بە یەکێك لە گەورە شاعیرانی نوێ، و نووسەری شانۆ لە جیهانی عەرەبیدا،ئەم پیاوە وەکو هەڵۆیەکی دێرینە پاشماوەکانی رۆژگاری کۆکردەوە و لە پشت دیواریکی پری وێنە و یادگارییەوە،دوورەپەرێزی خۆی بنیاتنا،وە لەسەر خوانی ژیانی ئەم پیاوە شاعیرێك دەخوێنیتەوە کە یاخیبوون لە ناوەوەیدا چەکەرەی کردووە و خەوتووە و دەنگە بەسۆزەکەی "فەیرووز" هیوایەکی نوێی پێدەبەخشێ،بۆ ئەوەشی زیاتری لە بارەوە بزانی،ئەوا لە هاوسەری تەمەنی بپرسە"سنیە" کە دوایین ئافرەت بووە لە ژێر دەواری خەمی ماغوت دا و لە بارەیەوە دەڵێ: ماغوت لە ژوورێکی داپۆشراودا لە دایکبووە کە ناوی رۆژهەڵاتی ناوەراستە، وە هەر لە یەکەمین کۆمەڵە شیعری" خەمێك لە ژێر تریفەی مانگە شەو

دا" هەوڵی دۆزینەوەی هەندێ بۆشایی یان فراوانکردن و گەورەکردنی شیشەکانی زیندان دەدات،ئەمەش بۆ ئەوەی کە جیهان ببینێ و هەندێك هەوای ئازادی هەڵبمژێتووە لوتکەی کارەساتیش ئەوەیە کە سوور بوو لەسەر ئەوەی دەیویست بەتەنها ئەم واقیعە بگۆڕێ،بەڵام هیچ چەکێکی گۆڕانی پێ نەبوو تەنها شیعر نەبێ، وە بە هێندەی ئەوەی کە لە خەوندا "وشە"ڕێگەیەکە بۆ ئازادی،ئەوا لە ژیانیی واقیعدا ڕێگەیەکە بەرەو زیندان،وە هەر لەبەر ئەوەشە کە "وشە"یەکێکە لە دیارترین قوربانی پەشێوییە سیاسییەکان لە نیشتمانی عەرەبدا،وە لەگەڵ هەر ڕاپەڕین و شۆڕشێکدا ئەم پیاوەلە ترسدا دەکەوتە لەرزین،

وە ماغوت لە بەرنامەی "الروافد"ی "کەناڵی العربیة" دا دانی بەوەدا ناوە کە هیچ پەشیمان نییە لە وشەیەك کە نووسیوێتی،گەورەترین ئەو ساتانەی کە پەشیمانە تێیدا،سەردەمی منداڵیەتی و دەڵێ: قەیسیمان لە باخچەکاندا دەدزی و بە ڕۆژانیش مریشك و هەندێ جاریش پاسکیلمان دەدزی و سواری دەبووین.هەروەها ماغوت بۆ پێشکەشکاری بەرنامەکە(احمد علی زین الدین) بە ڕاشکاوی دان بەوەدا دەنێت:کە هەمیشە لە جەدەلیەتی سەرکەوتن و دۆڕان-النصر و الهزیمە-خۆی بە دوور گرتووە و دەڵێ:کێشەکە لای من هەر بردنەوە و دۆڕان نییە،بەڵکو من هیچ شتێکی تر نازانم جگە لە نووسین،بەڵام ئەنجامی جەنگەکە بەلامەوە گرنگ نییە،من پیاوی نەخشە دارشتن نیم و تەنانەت ناشزانم چۆن نەخشە بۆ شتێك داڕێژم،لەبەر ئەوەش من دۆڕاوترین- -سەربازم. وە ماغوت وای دەبینێ کە نووسینی گاڵتە ئامێز "لوتکەی ئازارە" وە ئەو مرۆڤەی کە جیدیە و هەمیشە لەسەر خەتەکەیە،ئەوە لە ڕاستیدا مرۆڤێکی نەخۆشە"

منداڵیم دوورە..........

## عەودالْ و عاشقی کێشە دۆڕاوەکان:

لە سەرەتای لاویدا "ماغوت"ڕۆشتە دیمەشق بۆ خوێندنی کشتوکالْ،بەلاّم دواجار وازی لێهێنا هەرچەندە سەرکەوتوو بوو تێیدا،چونکە لە راستیدا حەزی لە تایبەتمەندی دەکرد لە بواری "مرۆڤە مێروولەکان دا"نەك "مێروولە کشتوکالْیەکان"وە هەر لەم بارەیەوە دەلْێ:هەر لە سەرەتاوە هەستم دەکرد کە هەلْەیەکی مێژووی هەیە لە نێوان مرۆڤایەتی دا و پێویستە چارەسەر بکرێ،لەبەر ئەوە منیش لەگەلْ کێشە دۆڕاوەکاندام تاکو مردن،وە کاتێك کە ڕۆشتە زیندانی"مزە" لەدیمەشق لە سالْی ١٩٥٥ لەسەر ئینتمای سیاسی ،ماغوت هیچ شتێکی بە دەستەوە نەبوو یادگارەکانی بنووسێ تەنها کاغەزی جگەرەکانی نەبێ،وە هەر لەگەلْ جلەکانی ژێرەوەیدا هێنایە دەرەوە پێش ئەوەی بڕوات بۆ بەیروت،و لەوێش هەر بە تەنها و غەریب مایەوە،وەك خێزانە شاعیرەکەی دەیلْێ،وە کاتێك ئەدۆنیس ، لە کۆبوونەوەیەکی قەرەبالْغی گۆڤاری"شیعر" دا پێشکەشی کرد و ناساندی و بە دەنگێکی ناسك چەند کۆپلە شیعرێکی خوێندەوە،بە بێ ئەوەی ناوی شاعیرەکە بلْێ،ئامادەبووان وایان دەزانی کە ئەمە شیعری "بۆدلێر یان ڕامبۆ"یە،دواتر ئەدۆنیس ئاماژەی کرد بۆ گەنجێکی نەناسراوی قژ بژی نیوە شێواو و وتی"ئەمە شاعیرەکەیە"،بێگومان ئەم ڕووداوەش سەرسامی کردن و ورتە ورتێکی نزم لە ناو ئامادەبووانەوە سەریهەلْدا، ئەو کات منیش بە بێ دەنگییەوە سەرنجم دەدا ،و ئەدۆنیس چاوی گەش بوویەوە و خۆشحالْ بوو.

# ماغوت ..شاعیرێکی یاخی و شۆڕشگێر:

(فاتـمة النظامي) لەبارەی دیوانە نوێیەکەی ماغوت ەوە"کۆچەرییە سوورەکە" دەڵێ:

ماغوت بە سنگێکی ڕووتی وەکو بانگدەرەکانەوە-المؤذن- و بە دەنگێکی ئازاردەرانەوە ڕووبەڕووی جەللاد و ستەمکارەکان بووەتەوە و دەڵێ:نا بۆ سەلەفیەت،نا بۆ تابۆ، نا بۆ ئاژاوە و نا بۆ نەگبەتی،نا بۆ زەلیل کردنی پێویستی و هەژاری،نا بۆ کڕنوش بردن و ملکەچ کردن،نا بۆ لەرینەوەی لاشەکان بە داری سێدارەوە،نا بۆ توانەوەی لاشەکان بە ئەسید و ترشەڵۆك،نا بۆ یاریەکانی شەوانە،نا بۆ کارپێکردنی منالاَن،نا بۆ گاڵتە و سوکایەتی کردن بە زەوی و سروشت،نا بۆ گۆڕینی دەریا و ڕووبارەکان بۆ زبڵخانە،نا بۆ مۆنۆپۆلکردنی ئازادی گەلان،نا بۆ سەردەمی کەنیزەك و زیندانی و خوێنەکان، نا بۆ لابردن و سڕینەوەی سمێڵ و خوێن ڕژاندن لە زیندانەکاندا هەموو ڕۆژێك.

ئەوەی کە ماغوت کۆتایی پێهێنا وەکو شاعیرێکی یاخی و شۆڕشگێر،لە ڕاستیدا لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٩ و بە یەکەمین قەسیدەی دەستی پێکرد بوو،وە ماغوت خۆی وەکو شاعیرێکی یاخی ناساند و ڕاگەیاند،بەلاَم ئێمە بە وردبوونەوەمان لە ژیانی ئەم پیاوە،بە ڕاستی سەرسام دەبین لە نێوان پۆلێنکردنە داهێنان ئامێزەکەی وەکو شاعیرێکی یاخی ، و شانۆ نووسێکی سیاسی کە هەمیشە دنەی ڕەفزکردن دەدات و ،سینەما کارێك لە شێوەیەکی تردا.

وە سەرەڕای کاریگەری گوندی"سلمیە" کە تێیدا لە دایکببوو، لەسەر شیعر و ژیانی،بەلاَم ماغوت هەر کوڕی دیمەشق و شاعیری کۆلاَن و هەژار و بەدبەختەکانی سەر شەقامەکانی بووە، وە لە پەیوەندیدا بەو

کەس و یادگاری و ناوەڕۆکە وردانەی کە هەمیشە لە بیر و خەیاڵیدا بوون کەسێکی نمونەیی بووە،لە نێوان ئەوانەشدا،ئەو وردە بەرد و زیخەی کە لە نێوان پێیەکانییەوە هەڵدەبەزینەوە و تەنانەت هەموو ئەوشتانەی کە تۆمار کراون هەر لە "صاڵحییە"وە هەتا "حەمیدییە" و لە "گۆتە" ەوە هەتا بەر دەرگای"تۆما"وە ماغوت هیچ شتێکی نەبووە پێی بڕواتە نێو دەرگا و سەراکانی دیمەشقەوە تەنها شیعرەکانی نەبێت، و لەمەشەوە چاوی منداڵە بچووکەکانی لە باوەش گرتووە و چاو باشقاڵی لەگەڵ کچە ناسکەکانی "باب تۆما"دا کردووە.

## سەرکەوتنی ئازادی:

ئەویش وەکو زۆربەی شاعیرانی دی،بارودۆخ و بزوتنەوەی تایبەتی خۆی هەبووە کە لەوانەیە بە دژی میلی کاتژمێرەکانەوە بڕوات،چونکە ئیتر ئەوە (ماغوت) ە و بە ئاشکرا ڕایدەگەیەنێ کە خیانەت لە نیشتمانەکەی دەکات،و گومان و دوودڵی لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە،و چاوی دەوڵەتیش بۆی دەکەوێتە کەمینەوە،بۆ ئەوەی بزانن و ئەو لایەنە بدۆزنەوە کە ماغوت لە بەرژەوەندی ئەو خیانەتی بۆ دەکات،بەڵام ئەوە چ نیشتمانێکە کە ماغوت بە شانازی و بە ئاشکرا دەیەوێ خیانەتی لێ بکا و پێشتر هەموو لایەك ئاگادار دەکاتەوە و سووریشە لە سەری ؟ ئەوە بۆ یەکەمین جارە کە دەوڵەت و دەزگاکانی دەدۆڕێن و فەشەل دەهێنن،چونکە بۆیان دەردەکەوێت کە ئەو ماغوت نووسیویەتی هیچ پەیوەندیەکی نە بە خیانەتی گەورە و نە بە خیانەتی بچووکەوە نی یە-الخيانة العظمى و الصغرى-بەڵکو تەنها دۆکیومێنتێکی کارەساتبارە بۆ داوەشان و پەرتبوونی عەرەب کە لە شانۆییەکانیشیدا هەستی پێ دەکەی.

وە ماغوت بەم کتێبە ڕەش و جوان و بەچێژ و ئازار دەر و گاڵتەجار و خۆشەی " خیانەت لە نیشتمان دەکەم" دادگایی هەموو ئەوانە دەکات کە بە زانین و نەزانین خیانەتیان لە نیشتمان کردووە،بەڵام ماغوت بە ئازادی سەرکەوتووە،ئەو ئازادییەی کە هیچ سنوور و ئاسۆیەکی نی یە:

"خۆشەویستم...

ئایا عەرەبەکان دەمکوژن

ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان زانیان

جگە لە شیعر و مۆسیقا......من هیچی ترم خۆش ناوێ؟
لە هیچ شتێ ورد نابمەوە...
جگە لە مانگ و هەورەکانی ڕۆژ نەبێ
کە لە هەر لاوە دەرکەون.........؟
یان هەر جارێك...
گوێ بۆ سەمفۆنیای حەوتی بتهۆڤن ڕادێرم...
بە پێی پەتی دەچمە دەرەوە و
ڕێبوارەکان لە باوەشم دەگرم ....و
فرمێسك لە چاوانمەوە دێتە خوار....؟"

بۆ یەکەمجار ماغوت لە شەستەکاندا لە بەیروت بە شێوەی پیاوێکی لادێی دەرکەوت،ئەو کات ناو و ناوبانگی هەموو مەیدانی شیعر و ئەدەبیاتی داپۆشیبوو،وە هەر بەو شێوە لادێیە گەڕایەوە بۆ دیمەشق،بەڵام بە شیعرێکی جیاوازەوە،بووە ئەو شاعیرەی کە بە زیاد لە چەکێکی داهێنەرانە بەرەنگاری هەموو شێوەکانی ستەم بووەوە، وە شیعری دامەزراند و لەم زەمەنی جیهانگیری و عەقڵە ئەلیکترۆنی و چەکی ناوەکی و ئاسایی بەکاریهێنا.

*  *  *

لە ڕاستیدا ئەزموونی ماغوت ناتوانرێ بەش بەش بکرێت،وە هۆش و هەستی ئەم پیاوە هەر لە یەکەم دیوانییەوە درێژ دەبێتەوە تاوەکو دوا وشەی کە لە ناو ئەو کتێب و بەرهەمانەی دا نووسیویەتی،لەبەر ئەوە دەبیبینی کە بواری شانۆ بە شانۆییەکانی داگیر دەکات ،وە شانۆییەکانی هەموو هۆڵەکانی شانۆی لە جیهان داگیر کرد تا دەگاتە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا،وە شەونخوونی دەکێشا بە دیار هەر کەسێکەوە کە هەوڵی بدایە لە سەری بنووسێت، لەبەر ئەوە جارێك سۆڤی یە ، و جارێك سوریاڵی یە،شۆڕشگێڕە،عاشقە،خۆگرە،نیشتمان پەروەرە،خائینە-بە چەمکی

خۆی-،تورڕەیە،کەسێتییەکانی کاریکاتێرین،بە زمانێکی تەقینەوە ئامێز دەنووسێت، بە بەردەوامی ئەو پیاوە لادێییە سروشتییەیە کە خوێندنی تەواو نەکردووە بۆ ئەوەی لە زیندانی"مزە" و زیندانەکانی تردا فێر ببێت، وە بە گەڕانی بە ناو کۆڵان و تەنگەبەرەکانی دیمەشق و بەیروت، و ناوچەکانی تردا،ویستویەتی کە ئەزموونێکی نموونەیی و بێ وێنە پێکبهێنێ و تا نیوەی دووەمی سەدەی بیست درێژ بێتەوە.

## باو باپیرانم لە کوێن

لە یەکێك لە دەقەکانیدا ماغوت دەڵێ:"ئەگەر نەخۆشخانەکانی خۆمان چاك و بێ گەردن،بۆچی وەزیری تەندروستی لە دەرەوە چارەسەر دەکرێت؟". وە ئەم دەقە ئەگەر شیعریش نەبێ،کە لە ڕاستیدا شیعریش نییە،ئەوا هیچ شتێکی لە شیعرێکی سەرکەوتوو کەمتر نی یە.

ماغوت : ڕقی لەرەخنە گرتن نییە بەڵکو دژی تۆمەتبارکردنە.

# منداڵییەکی پاك و پیرییەکی ترسناك

کارەساتی گەورەی ماغوت ئەوەیە کە لە ژوورێکی داخراو و رووپۆشراو دا لە دایکبوو بە ناوی رۆژهەڵاتی ناوەراست، هەر لە یەکەم کۆمەڵە شیعری یەوە (غەمێك لە ژێر رۆشنایی مانگ دا ) هەوڵی دۆزینەوەی هەندێك کون و کەلەبەری داوە ، یان هەوڵی کردنەوەی شیشەکانی زیندانی داوە بۆ ئەوەی تۆزێك هەوای ئازادی هەڵمژێت، ترۆپکی ئەم کارەساتەش سووربوونی بووە لە سەر گۆرینی ئەم واقیعە بە تەنها، بە بێ هیچ چەکێکی گۆرانکاری جگە لە شیعر.وە بە هێندەی ئەوەی کە لە خەوندا وشە رێگەیەکە بۆ دەستەبەر کردنی ئازادی،دەبینین کە لە واقیعدا رێگەیەکە بەرەو زیندان.لەبەر ئەوەش یەکێك بووە لە دیارترین قوربانی یەکانی هەموو بشێوی یە سیاسییەکان لە نیشتیمانی عەرەبدا . ئەم شاعیرە لەگەڵ هەر راپەرینێکدا کە لە نیشتمانەکەیدا رووی بدایە،ترس و لەرزین دایدەگرت لە یەکێك لەو بارودۆخانەش دا،رۆشتم و دەگەرام بە دوای دا،چونکە لەسەر رێگەی ئەوەبوو کە پەلکێشی زیندانی بکەن یان شتێك لەو خراپتر بێت،بەڵام کە گواستمەوە ژوورێکی تازە ئیتر تۆزێك شارایەوە ، ژوورێکی بچووکی تەنگی نزم کە لە دامێنی یەکێك لە ئاپارتمانەکان دا رۆنیشتبوو،بە شێوەیەك کە هەر یەکێك لە دەرگاکەی بدایە وەك ئەوەبوو بپەرێتەوە بۆ زەمەنێکی تر.

ژوورەکەش،نوێنێکی کۆن،بەتانی زەرد،چەرپایەکی شینی درێژی دارزاو کە خەریك بوو قاچەکانی دەکەوت، پەردەیەکی سوور لە پاشماوەکانی شانۆیەکی کۆن،لە ناو ئەم دۆخە دا چەند مانگێکی بەسەر برد.با وا دابنێین کە رۆژهەڵاتی عەرەبی خاڵێکی رەشە لە سەر نەخشەی

ئێستا و ڕابردوو،ئەی کەواتە ڕەنگی داهاتووی چۆن دەبێ؟پاش ئەوەش بگەڕێین بە دوای چارەنووسی شیعر و شاعیرەکانی دا لە نێو ئەو تاریکییە ئەنگوستە چاوەدا.

وە ئەگەر تۆزێك یادەوەریمان بخەینە کار دەبینین کە محمد ماغوت بە شێوەیەك لە شێوەکان بەشێکە لە داهاتوو،لەبەر ئەوە پێویستە لەم بێهوودەییەی ئەمرۆدا بیپارێزین،ئەمەش بۆ ئەوەی کە داهاتووی شیعرمان نەبێتە خۆڵەمێش ئەگەر شاعیرەکانمان بۆ دەسەڵات بە جێ بهێڵین ؟ وە لەبەر ئەوەی کە ئەم شاعیرە بە ئاگری ڕابردوو و ئێستا هەڵقرچا بوو ،پەنای بردە بەر ئاگری داهاتوو کە خۆی بەشێك بووە لێی بۆ دۆزینەوەی ژیانێکی تری نوێ.بە نیسبەت هەردووکمانەوە ڕۆژەکانی سەرەتا وەکو یاریەکی پاڵەوان ئامێز دەردەکەوت،بەڵام هەر کە ماغوت ڕەنگی بەرەو زەرد بوون و پەڕیوی و نەخۆشی ڕۆشت،و میزاجی خراپتر دەبوو،لێرەوە هەستم بە ترسناکی یاریەکە کرد،خەفەتی گەورەی من ئەوە بوو کە باهۆزەکە بڕەوێتەوە بەبێ ئەوەی کە "هەڵۆ" کەبخنکێنێ.

من بە دزی یەوە خواردن و ڕۆژنامە و گوڵم بۆ دەبرد،شانازیمان بە جیهانی خۆشەویستی و شیعرەوە دەکرد وەکو جیهانێکی ئەڵتەرناتیڤ لەسەرووی ئەو جیهانەی کە دەوری دابووین،ئەویش بە حەزێکی شێتانەوە دەیخوێندەوە،منیش بە گەرما و سەرما هەر ڕامدەکرد بۆ ئەوەی ئەم حەزەی تێر بکەم .هەر کە کتێبێکی گرنگم دەبینی ئەگەر چی دڕاو و لێك هەڵوەشاویش بایە و قاوە بەسەر پەڕەکانی ڕژابایە،من هەڵمدەگرتەوە و دەمشۆرد و پاشان لەسەر پەنجەرەکە ڕیزم دەکردن تا وشك دەبوونەوە،ماغوت ئاگری تایبەتی خۆی بە شاکارە ئەدەبییەکان دادەگیرسان ،لە کاتێکدا دەنگە دەنگ و هوتافاتی دەرەوە شێوەیەکی دژی وەردەگرت.

پێشتر ماغوت لە بەیروت دا غەریب و تەنها بوو،بەڵام کاتێك ئەدۆنیس

له كۆبوونەوەيەكی قەرەباڵغی گۆڤاری "شيعر" دا پێشكەشی كرد و ناساندی و بە دەنگێكی ناسك چەند كۆپلە شيعرێكی خوێندەوە،بە بێ ئەوەی ناوی شاعيرەكە بڵێ،ئامادەبووان وايان دەزانی كە ئەمە شيعری "بۆدلێر يان رامبۆ"يە،دواتر ئەدۆنيس ئاماژەی كرد بۆ گەنجێكی نەناسراوی قژ بژی لات و وتی"ئەمە شاعيرەكەيە"،بێ گومان ئەم رووداوەش سەرسامی كردن و ورتە ورتێكی نزم لە ناو ئامادەبووانەوە سەريهەڵدا، ئەو كات منيش بە بێ دەنگييەوە سەرنجم دەدا ،و ئەدۆنيس چاوی گەش بوويەوە و خۆشحاڵ بوو.

ئێمەش لە ژێر ئەم رۆشنايی يەدا غوربەتی محمد ماغوت دەخوێنينەوە، لەگەڵ بەسەر چوونی رۆژگار دا ماغوت لەم دوورە پەرێزيەی دەرنەچوو بەڵكو تەنها لە دوورەپەرێزی غوربەتەوە گۆڕی بۆ دوورەپەرێزيەكی رەفز كردوو.

وە هەركەسێك لێكۆڵينەوەی كردبێ لەسەر ژيانی ئەم شاعيرە دەبينێ كە ماوەی توانايی لەگەڵ كێشەكان دا دەگونجێت،"بۆ نمونە "چۆلەكەی قەموور" و چەند كارێكی تری تا ئێستاش لە ناخی خۆيدا شاراوەيە،وە بەشێكی زۆری "دڵخۆشی كاری من نييە"لە ئەنجامی تەقينەوەيەكی دەروونی بەهێزی مرۆڤ ئاسا دا رووی دا لە كۆتاييەكانی ئەو زستانە دا،وە لە نێو جەرگەی ئەم گەرمی و هەڵچوونە دا پەيوەندی شتەكانی دەبينێ بە هەندێ شتی ترەوە وە هەركەس لێكۆڵينەوە بكات لە سەر ژيانی ئەم پياوە،دەبێنێ كە كاتی پێگەشتن و دەركەوتنی هاوكات بووە لەگەڵ دەركەوتنی كێشە و ململانێكان دا، ديوانی "چۆلەكەی قەموور" و چەند كارێكی تری تا ئێستاش شاراوەن و ڕووناكيان نەديوە،وە بەشێكی زۆری ديوانی"خۆشبەختی كاری من نی يە" لە ئەنجامی تەقينەوەيەكی بەهێزی ناوخۆيی بووە لە كۆتاييەكانی ئەو زستانە دا،لەم تايە گەرمەيدا پەيوەندی شتەكانی بە يەكترييەوە دەبينی،ئەم پەيوەنديانەش دواجار

بوونە پەیوەستی یەکی ترسناك لە کاتێکدا یەکێکیان بە هێز بوو وە ئەوەکەی تریان لاواز و بێ هیچ دەرەتانێك هەڵدەلەرزی.

وە محمد ماغوت هەر لە منداڵی یەوە بە دوای پارێزگاریدا دەگەڕا،وە هەر کە پەنای بۆ گۆشەیەك ببردایە وەك زیندان یان وێرانە دەهاتە بەرچاوی،دەیویست بچێتە نێو شیعرەوە کە تێیدا تەنها براوەکان سەرکردەن،تەنانەت ئەو ژینگە ئاڵۆز و نالەبارەش کە تێیدا دەژیا،وەك قامچی بەرەو ڕووی دەوەستایەوە بۆ ئەوەی بەردەوام بیگەڕێنێتەوە بۆ ناوەوەی و تەنها پەیوەست بێت  بە خەیاڵدانی خۆیەوە،وە لەو گەلەکۆمەیەشدا کە ژینگەکەی لە دژی بەرپای کرد، بێتاوانیەکەی ماغوت گەورەتر و پاکێتی یەکەی بەهێز تر بوو،وە ئەو مانەوە نهێنی یەی هەلێکی باشی بۆ ڕەخساند بۆ ڕۆچوون بە ناو بیر و خەیاڵی خۆیدا،لەو کاتانەشدا مرۆڤایەتی بە نێو چەند گۆڕانکارییەکدا تێدەپەڕی، و ژەهری کارەساتباری خۆی بەسەر بارگرژی مرۆڤایەتیدا دەڕشت،لەبەر ئەوە تاك بوون(ئیندیڤیژوالیزم) لە ناو خۆیدا بوونێکی بێ سنووری هەڵدەگرت،وە هەر ئەمەش پاڵی پێوە نا بۆ لێدانی چەند ڕەنگ و دەرگایەکی تر جگە لە شیعر نووسین، ماغوت لە شیعردا ئەسپی خۆی تاو دەدات و لە چاوان ون دەبێ،نەك بە مانای وازهێنان لە هەستی واقیعیانەی،بەڵکو بە واتای ئەو ئارەزووە توندەی بۆ دروستکردنی ئەڵتەرناتیڤێکی تر،بوونێك تر کە لە سەفەریشدا دایبپۆشێ.

بێگومان ژووری شیعر،ژوورێکی نەرم و فراوان و گەورەیە،لەگەڵ هەر ئاماژەیەکدا شاعیر دەتوانێ لێوەی بگوێزێتەوە،بەڵام ئێستا هیچ پەنایەکی تری نییە چونکە ماغوت دەکەوێتە نێو ئەو دیوارە چڵکنەی ڕووبەڕووبونەوەی واقیعەوە. لەبەر ئەوە بارودۆخی پاڵەوانەکانی نێو "چۆلەکەی قەموور" دەکەنە زیندانەوە، بە شێوەیەکی نارێك دروستی کردوون،ئاڵۆز و بەیەکدا چوون، ماوە-المسافة-لە شانۆییەکاندا ناتوانێ

ئاراستەیان بکات بەرەو خەونەکانیان بەڵکو گەمارۆیان دەدات،وە هەر کاتێك ئازادیان هەبوو،ئەوا بەرزایی یە مرۆڤایەتی یەکانیان دەگۆڕێت و چوونەتە نێو پەیوەندی تازەوە ، وهەندێ جارگەمەی دەسەلاتیان پیادە کردووە و هەندێ جاریش ڕەعیەت بەلام هەر نەیانتوانیوە کە لە سنووری ئاسایی خۆی تێپەڕ بکەن سەرەرای بوونی ئەو ئازادیەی کە هەیانبووە،لە "چۆلەکەی قەموور"دا محمد ماغوت نەیتوانیوە بگات بە خەڵکانی خۆی بە مانای ڕووبەڕووبونەوە،بەڵکو بە ڕاکێشان و ئاراستە کردن ئەمەی بەدی هێناوە،وە لەبەر دووری ڕەهەندی ڕۆژگار لە نێوان خۆی و خەڵکانی تردا وازی لە شانۆیی هێناوە و ناوی لێنا قەسیدە ،لە ڕاستیشدا ماغوت لە"چۆلەکەی قەموور" دا سەرۆك و ڕابەری هێزێکی شێواو و پەرپووت ، و هەژار و ئاسایی یە،لەبەر ئەوە سەرۆك لە "گاڵتەجاڕ"دا دەگەڕێتەوە و حەیای ئەو سەرشۆڕی و زەلیلیەش دەبات.

ماغوت بە دیارترینی ئەو شۆڕشگێڕانە دادەنرێت کە شیعریان لە کۆیلەیەتی ڕووخسار ئازاد کرد،ڕۆشتە نێو مەیدانی جەنگ و هەڵگری ئەو دەفتەرە ناسکانە بوو کە مژدەی هاتنی قەسیدەی پەخشانی دا وەکو شێوەیەکی داهێنراو و نوێ لە بزوتنەوەی شیعری تازە دا.

وە هەرچەندە لە مەیدانی جەنگدا گژەبایەکی گەرم و توند هەڵیکرد بوو، و ڕۆژنامەکاننیش نوقمی ئەسرینی ئەو کەسانە بوو کە بۆ چارەنووسی شیعر دەگریان،ڕاست لەو کاتەدا ماغوت قەلا سپییەکانی خۆی لەسەر بەرزترین لوتکەکان ڕاگەیاند .وە سەرەتاش ڕۆلێکی گرنگی گێڕا لە هێنانەدی ئەم شێوە شیعرەدا،چونکە ئەو بەهرەیەی کە توانی بە ڕەسەنی و ئازادیەوە ڕۆڵی خۆی تێدا بگێڕێ لە باوەشی کلتوور و بێزاری پەروەردەییەوە وەریگرتبوو،وە هەر لەبەر ئەمەش ئەو بێ باکییەی لە وشکهەلاتن و چەق بەستن ڕزگاری بوو، وە ئەمەش یەکێکە لە فەزیلەتە دەگمەنەکان لەم سەدەیەدا.

## لەبەر دەرگاوە بۆ ئاسمان

ئێستا ...
بارانێکی غەمگین
ڕووخساری غەمگینم دەشواتەوە..
خەون بە پلیکانەیەکی گڵینەوە دەبینم!
بە پشتە قەموورەکان ....و
ئەو دەستانەی لە سەر ئەژنۆکان دانراون..
بۆ ئەوەی سەرکەوم بۆ کەشکەڵانی فەلەك... و
بزانم.
حەسرەت و نوێژەکانمان بۆ کوێ دەڕوا
ئاه... ئەی خۆشەویستم
بێگومان
هەموو حەسرەت و نوێژەکانمان
هەموو هاوار و فریادەکان
کە لە ملیۆنەها زار و سنگەوە هاتونەتە دەرێ
بە ناو هەزاران ساڵ و سەدەدا تێپەڕیون..
وەکو هەور لە شوێنێکی ئاسمان دا کۆبوونەتەوە.
لەوانەشە ...

ئێستا پەیڤەکانم
لە پەیڤەکانی مەسیحەوە نزیك بن
دەبا چاوەڕوانی گریانی ئاسمان بکەین
خۆشەویستم.

*        *        *

## خەون

لەو دەمەوەی سەرما و دەرگا داخراوەکان
داهێنراون..
وەك نابینایەك دەست دەکوتم..
بۆ دیوارێ دەگەڕێم!
یان بۆ ژنێ دالّدەم بدا...
وەلێ مامزێکی نابینا
چی لە کانییەکی بە خوڕ بکات..
بولبولێکی یەخسیر ..
چی لەو تیشکانە بکات
بەر شووڵەکانی قەفەزەکەی دەکەوێت..
لە ڕۆژگاری بۆمبا و عەقڵە ئەلیکترۆنییەکاندا..
لە سەردەمی بۆن و گۆرانی و
تیشکە کزەکاندا..
من باسی گۆرانی کۆچەری و
سەفەری بیابانم بە سەر پشتی وشترەوە
بۆ دەکرد...
مەمکەکانیشی گوێیان بۆ شل کردبووم
چوون مناڵە ژیکەڵەکان

بۆ چیرۆكی گوێ ئاگردان
گوێ ڕادەگرن
ئێمە خەون بە بیابانەوە دەبینین
وەك چۆن ڕاهیبێ بە هاوسەرینی و
هەتیوێ خەون بە شمشاڵەوە ببینێ
من پێم دەوت و نیگاكانم
بۆ ئاسۆیەكی دوور دەنارد
لەوێدا پاڵ دەدەین
بە لمە شینەكانەوە و
هەتا سبەینانێ بە ئارامی دەنووین
نا لەبەر ئەوەی پەیڤەكان كەمن
بەڵكو پەپوولە ماندووەكان
لەسەر لێوی ئێمە دەنوون
سبەینێ ......خۆشەویستم سبەینێ
زوو لە خەو ڕادەبین
لەگەڵ كەشتیوان و چاڕۆكەكانی دەریا دا
لەگەڵ هەوادا وەك باڵندە بەرز دەبینەوە
وەك خوێن لەكاتی توورە بووندا
ئێمە بە سەر بیاباندا دەكەوین
وەك چۆن لێوێ بە سەر لێوێكی تر دا دەكەوێ
بە درێژایی شەو بە لێك ئاڵاوی خەوتبووین
دەستمان لە سەر جانتاكانمان دانا بوو
سبەینێ كەڵكەڵەی سەفەرمان نەما
چونكە بیابان لە نێو دڵمان دا بوو.
* * *

## قەرەجی لە قوتو نراو

بە بێ سەیری کاتژمێری سەر دیوار
یاخود ڕۆژژمێری گیرفان
من وادەی قریشکانم دەزانم
لە ڕێگا و بانەکاندا سەودا سەرانە
دەستی ئەم دەگوشم و خودا حافیزی لەوی تر دەکەم
بە دزییەوە دەنۆڕمە باڵکۆنە بەرزەکان
ئەو جێگایانەی تەنها نینۆك و ددانەکانم دەیانگاتێ
لە شۆڕشەکانی ڕابووردو دا
بە ڕێکەوت برسی نەبووم
لە خۆشیدا و هەر لە خۆڕا باشیل نەبووم
"گوڵە گەنمێك نییە لە مێژوو دا
دڵۆپێ لیکی منی نەڕژابێتە سەر"
دەزانم ئایندەم تاریکە و
کەڵبەکانم دەبن بە مۆم
دەزانم قەراغی پەپکەیەك
هێندەی ڕەقی خەنجەرێکە و
ڕووباری برسی یەکانیش
بە چارۆکە خوێناوییەکانییەوە

به شانه خۆڵاوییەکانییەوە ..........ڕۆژێك هەر بە هەدەر دەڕوا
من پێغەمبەرێکم و
تەنها ڕیش و گۆچان و بیابانم کەمە
بەڵام هەر چەکەکەم لە شان داناگرم
لە "قادسیەی هەویر" دا
لە "واتەرلۆی شۆربا" دا
کە جیهان تێوەی دەگلێ
خوداوەند وەها خولقاندومی
کەشتی و باهۆز بم
دارستان و دار بڕبم
ڕەش پێستێکی ڕەنگاڵەیی بم وەك شەبەنگ
وەکو بەهار
لە خوێنمدا سەمای فاڵس و
لە ئێسکەکانمدا
شین و واوەیلای کەربەلا هەیە
هێزێك نییە لە جیهاندا
شتێکم لا خۆشەویست کا
خۆشم نەوێ
ڕقم بۆ شتێ بجولێنی
ڕقم لێ ی نەبێ
مادامەکی
توتن و شقارتە و شەقام هەیە

*     *     *

# پایزی دەمامکەکان

ئەی پیادەکان
شەقامەکان خاڵی کەنەوە  لە پاکیزەکان
لە ئافرەتانی پەچە پۆش
من بە ڕووتی لە ماڵەکەم دێمە دەرەوە  و
دەگەڕێمەوە بۆ
دارستانەکەم
ئەستەمە ..........ئەستەم
خۆم چوون ڕووبارێك لە بیاباندا
نەیەتە بەر چاو
یان کەشتی یەك لە دەریا دا
یان...مەیمونێ میوەی کاڵ لێبکاتەوە و
بیگرێتە سەری ڕێبوارەکان
بە پێکەنین و چەپڵە لێدانەوە
بە سەر لقێکەوە بۆ لقێ تر باز بدات
نە لە گیرفانمدا ناسنامە هەڵدەگرم  و
نە ژووانیش لە یادەوەریمدا
نە لە چاخانەیەکدا دانیشتووم  و
نە بە شەقامێکدا پیاسەم کردووە

من منالّم
ئەها بە ئاستەم جەستەم درێژ دەکەم
تا دانە شیرییەکانم لە درزی دیوارەکاندا بشارمەوە
من پیرم
ئەها پشتم دەچەمێتەوە و
ڕێبوارەکان
دەستم دەگرن
من پادشام
ئەها شمشێرەکەم شۆڕ دەبێتەوە و
ئەسپەکەشم لە سەر گردەکان
دەحیلێنێ
من سواڵکەرم
ئەها دانەکانم بە شۆستەکاندا دەخشێنم و
شەقام شەقام
دوای ڕێبوارەکان دەکەوم
من قارەمانم ...ئەی کوا نەتەوەکەم؟
من خۆ فرۆشم...ئەی کوا سێدارەکەم؟
من قۆندەرەم...ئەی کوا ڕێگاکەم؟

* * *

## سەلمیە

سەلمیە.....ئەو فرمێسکە بوو
کە ڕۆمانەکان بە سەر یەکەمین
دیلدا ڕشتیان
کە کەڵەپچەی بە دانەکانی کردەوە
سەلمیە.........ئەو منداڵە بوو
لە کەناری ئەوروپاوە ساتمەی کرد و
یاری بە گوارە فاتیمیەکانی و
بە کاکۆڵی زێرینی دەکرد
لەو کاتەوە دانیشتووە و هەر دەگری
بووکە شووشەکەی لە دەریا دایە و
پەنجەکانی لە بیابان
لە باکوورەوە ترس و
لە باشوورەوە خەفەت و
لە ڕۆژهەڵاتەوە گەرد و خۆڵ و
لە ڕۆژئاواوە قەلەڕەش و گردۆڵکەکان
سنووریان بۆ کێشاوە
وەرزەکانی هەمیشە ڕوو لە یەکترن
چوون دوو چاوی غەمگینی نێو شەمەندەفەرێك

پەنجەکانی هەمیشە کراوەن
وەك ئەو دەمانەی هاوار دەکەن و
ئەو دەمانەی هاوار دەدەنەوە
لە هەموو مشتە خۆڵێکیدا
باڵی پەپولەیەك یان
کۆتی دیلێك هەیە
پیتێکی موتەنەبی یاخود قامچییەکی حەجاج
ددانی خەلیفەیەك یان فرمێسکی هەتیوێك هەیە
گوڵەکانی هەرگیز لە لمەکاندا ناپشکوێن
چونکە چارۆکەکان لە گۆپکەکانیدا پێچراوەتەوە
مێرووله دەوری گوڵە گەنمەکانی داوە
بەلام هەرگیز برسێتی ناناسێ
چونکە منداڵەکانی هێندەی ژمارەی هەورەکانێتی
هەموو چراکانی پەروانەی خۆیان هەیە
هەموو پیرەکانی ئاگردان ...و کۆلوانەی
خۆیان هەیە
وەلێ تا هەتایە غەمبارە
چونکە باڵندەکانی بێ پەناگان
هەرکە نەسیمێ لە شەو دا
هەڵیکرد
پەردەکانی چوون چاو تروکاندن
دەلەرێنەوە
هەر کە شەمەندەفەرێ لە شەو دا
تێپەری
ماڵی دڵتەنگ و تاریکی

دەلەرزێتەوە
وەك كۆمەڵێ جانتای لە هەوادا هەڵواسراو
چونكە ئەستێرەكان پەنجە گەلێكی كراوەن
-لە ئەزەلەوە- كراوەن بۆ هەڵكێشانەوەی.

*      *      *

# گەمارۆ

هێندە سەیری ئاسمانم کرد و
گریام
ئەسرینەکانم شین دەچنەوە
هێندە خەونم بە گوڵە گەنمە زێڕینەکانەوە
بینی و گریام
فرمێسکەکانم زەرد دەچنەوە
با سەرکردەکان بڕۆن بۆ جەنگ و
عاشقەکان بۆ دارستان و
زاناکان بۆ لابۆرەکان
بەڵام من
بە دوای تەسبیحێك و کورسییەکی کۆندا
عەوداڵ دەبم
تا بگەڕێمەوە تاف جارانی خۆم
چوون کۆن پۆشێ لەبەر دەرگای غەمدا
مادام هەموو کتێب و
دەستوور و ئاینەکان
دڵنیام دەکەنەوە
لە برسان یان لە زینداندا نەبێ نامرم.

# ڕۆژژمێری کۆچی

لەسەر ئەم شەقامە بەسۆزەی وەکو دایکم
دەستم دادەنێم و سوێند بە شەوگاری
درێژی زستان دەخۆم
ئاڵای نیشتمانەکەم لە سەر ئەستوونەکەی
دائەگرم و
سەر قۆڵ و قۆپچەی بۆ ئەدوورم و
وەکو کراس لە بەری دەکەم
ئەگەر چی نەشزانم
لە چ پایزێکدا پەلاسی بەرم شڕ دەبێ
لەگەڵ یەکەم زریان
کە بە سەر نیشتیمانمدا هەڵدەکات
سەردەکەومە سەر گردێك
نزیك لە مێژوو
شمشێرەکەم دەگرمە دەستی تاریق و
سەریشم بۆ سەر سنگی خەنسا و
قەڵەمەکەم بۆ پەنجەکانی موتەنەبی و
وەکو درەختێکی ڕووتی زستان دادەنیشم
تا بزانم کەی برژانگی نوێ ...و فرمێسکی نوێمان بۆ دەڕوێت

لە بەهار دا؟
نیشتمانم ....
ئەی گورگەکەی وەك درەخت
چەماوە بۆ دواوە
ئەم "وێنە فۆتۆگرافیانە" بۆ تۆ
وێنەی کەلاوە و وێرانەن
ئەم باڵندە بە جریوانە و
ئەم چارۆکە کاروانیانەی لە سەر پوولەکانی
پۆستەن بۆ تۆ
ئەم لەشکرە سەرکەوتووە و
ئەسپە بە حیلەکانی سەر شووشەی درز بردوو
بۆ تۆ
ڕیشاڵی بەرماڵ و
ئەم نینۆکە کۆکراوانەش بۆ تۆ
کە لە کۆتایی
پەنجەکان دا لە ماڵی هەتیوان دەچن و
لە سەر شۆستەکان شوێن هەنگاوەکانمی
پێ دەسڕمەوە....
پێیەکانم لە سەروو پاژنەوە
دەبڕمەوە و
دەیانهاومە دەریاوە
یان ناو سندووقەکانی پۆستەوە
وەکو کوللە هەڵبەز و دابەز ئەکەم
تا سەردەمی ئەسپ سواری و
ڕاداری پێش لێدان دەگەڕێتەوە.

## کۆچەری یەك بە دوای وڵاتی کۆچەریاندا دەگەڕێت

ئەی نوێنی سارد و تاریکی وەك کۆڵان
چەند ئاواتمە بە تەور قرنج قرنجت بکەم
کوان ئەو لێوانەی ماچم دەکردن؟
ئەو مەمکانەی یاریم پێ دەکردن؟
هەروەك چارەنووس دەمانچەی
لە پشتم توند کردبێ و
بە ڕۆژی ڕووناك هەموو شتێکم تاڵان بکات
ئاهـ...چەند ئاواتمە
ئەگەر بەیانی یەك لە خەو ڕابم و
چاخانە و خوێندنگا و زانکۆکان
وەك زۆنگاو و قەوزە خەوتووەکان ببینم
بووبێ بە چادرگە و
سەگەکان لە دەوری بوەڕن
شار و باخچە و پەرلەمانەکان
وەك تەپۆڵکەیەکی لم ببینم
وەکو بیر عەرەبەکان ئاوی
لێ هەڵگۆزن
ئاهـ...چەند ئاواتمە لەم ساتە دا

له گوندێکی لاتەریکدا
گەرم داهاتبم
لە سەر پێخەفێکی نامۆ و
لە ژێر ساپیتەیەکی نامۆ دا
پیرە ژنێ
کە پێشتر چاوم بە چاوی نەکەوتبێ
دەسرە تەڕەکەی بگوشێ و
لە سەر تەوێڵم داینێ و
لێمبپرسێ :
ڕۆڵە خەڵکی کام وڵاتی ؟
منیش بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە
وەڵامی دەمەوە و بڵێم :
ئاهـ داپیرەم.........

## پادشایەك لە باران....پەراوێزێك لە تەپوتۆز

١-تارماییەکی بچکۆلە
تۆ ئەی ئەوەی یاری بە تاڵەکانی باران دەکەیت
چوون خوری ڕێسێکی نابینا
دەست بە پاشماوەی جۆگە شینەکاندا دەهێنیت
وەك نابینایەکیش ڕووخساری بەندەکانی خۆت دەناسیتەوە
تۆ کێ ی ؟
ئەی شەقامەکان...ئەی مەیخانەکان
ئەو تارماییە کێیە لە سەر شۆستەکان پاڵکەوتووە
مێرووله تەسبیح و دەسماڵ و تاڵە قژەکانی ڕادەکێشێ؟
ئەوە بەردایە..
بەردا ؟
بیرم ناکەوێتەوە برایەك یان هاوڕێیەکم بەو ناوەوە هەبێت
ئەوە سندوقە یان دیوار؟
-مەولام.....ئەوە بەردایە.....
ئەو ڕووبارەی گوڵە تینووەکان هاوڕێیەتی ئەکەن
لە سەرچاوەکەیەوە تا ڕێژگە
با سبەینێ بێتە سەردانم
بۆ نووسینگەکەم...کە دەکەوێتە نێوان شەقامەکانەوە

لێمگەڕێ با هەتیوخانەیەکی دەریایی بۆ بدۆزمەوە
یان هەورێکی چڵکن بنیاتی نابێ
مەولام.....ئەوە دەرۆزەکەر نییە
ئەوە بەردایە
بەردای زمان فسی چکۆلە
گەورە بووە و ئێستاش پیرە
بەروانکە سەوزەکەی سەر سنگی دارزاوە
ئیتر ڕێرەوی خۆی جێناهێڵێت
نە لە مانگە شەوەکان ...و
نە لە ڕۆژانی پشوو و یەك شەممەکاندا
ئەو پۆزش بۆ تیژڕەوییەکانی ڕابوردووی دەهێنێتەوە
دەستەکانی دەخاتە سەر سنگی ......و
بە گریانەوە ئاوەڵایان دەکات
چوون ڕاهیبەیەکی لاقە کراو
لە پێناو بەلەمێکی لە کاغەز دروستکراو
یان پەڕەسێلکەیەك....ئاوەکەی بڕێژێت و بڕوات
با وا بێ
خودا هەموو شتێکی پێ بەخشی
لە هەموو ئەو شتانەی ڕووبارێکی چکۆلە خەونی پێوە دەبینێ
لە چینێکی ناوەنجی
لە لیتە و مێشوولە و لە بەهار
بەڵام ئەو هەمووشتێکی بەسەر دا باریوە
لە ماوەیەکدا
جوانترین باران لە مێژوو دا
جوانترین هەوری ڕۆژهەڵاتێکی بڵند

ئاوەكەی بە غەرغەرە..... و شۆرینی مردووەكانەوە بە هەدەر دا
با سبەینێ سەردانم كات نووسینگەكەم دەكەوێتە ناو
گژەبایەكانەوە
داوای بەزەیی هاتنەوە بە لاكانییەوە هەڵواسراوە
پێستی ئەو هەڵۆ هەڵواراوەی سەر دیوارەكە
هەرگیز بەزەیی من نابزوێنێ ......بەڵكە
خوێنی كەلاك و قریشكەی قوربانییەكانیم بیر دەخاتەوە

٢ – تارماییيە گەورەكە
تۆ ئەی داپیرە غەمگینەكەم
ئا لەم ساتە دا
چی لە چارشێوە خاڵ خاڵ و لاگیرە كۆنەكەت دەكەی ؟
ئەی تەسبیحەكەت لێ ون بووە
كاتێ لەم گیرفانەوە دەتخستە ئەو گیرفان ؟
یان كورەكانت دەریان كردووی
كاتێ سەرقاڵی وتی وتی و جوینی شتەكانی ناو دەمت بووی؟
ئەی زەوی
ئەی ئاسمان
ئەو پیرەژنە چەق بەستووە لەو دووریانەدا كێیە ؟
كە مێشوولە لە ژوور سەری دەخولێتەوە
وەك بڵێی گڵۆپ یان زۆنگاوێك بێت ؟
ئەو ..... نە پرسیار دەكات..... و نە وەڵامیش دەداتەوە
وەلێ بە ڕاست و چەپدا سەر دەجولێنێ
سەرپۆشە بە فرمێسك تەڕ بووەكەی دەجوێ
ئەوە دیمەشقە

دیمەشق ؟ دایكێك یان خوشكێك ...بەو ناوەوە ناناسم
ئەوە عەمبارە یان چەكوش یان ئاوێنە ؟
ئەوە شارەكەی تۆیە...مەولام
شاری من ؟ من شارم نی یە جگە لە گیرفانەكانی خۆم
شارەكەت......نیشتمانەكەت
نیشتمانەكەم؟ من نیشتمانم نییە جگە لەم پارچە و هێڵە خوار و خێچانەی سەر نەخشەكان ....و
ئەو دوكەڵەی هەمیشە لە نێوان لێوەكانمەوە دەیدەمەوە
بەڵێ ........بەڵێ
بیرم كەوتەوە
دیمەشقی وێرانە و خاپوور
دیمەشقی وەك هێلكەی كوولاو ...و
دیمەشقی ئەو بابۆڵە پێچراوەی بە نەوایەكی زۆرەوە دەخرایە جانتای قوتابخانەوە
دیمەشقی ئەسپە سەركێشەكان ....و
دیمەشقی ئەو كەشتیانەی بەری ئاسۆ دەگرن
دیمەشقی تەپوتۆز ....و
ئەو پاسكیلەی پاڵیداوە بە دیوارێكەوە
دیمەشقی ئەستێرە و مەشخەڵە گەشاوەكانی سەر لوتكەی ئۆراڵ
دیمەشقی شەو ...و چرای كوژاوە بە فووی دەم
دیمەشقی هۆرە ...و خەنجەری پاككراوە بە ئالاكانی كیسرا
دیمەشقی زمان لاڵ ...و
ئەو پەنجە سراوانەی ژێر كورسی و قاچی مێزەكان
دیمەشقی هەڵتۆقیو لە سەر زەریای ئەتڵەسی
دیمەشقی چەماوەی بەر بەلوعەكان

دیمەشقی قوڕ ..دیمەشقی ئەستێرەکان...دیمەشقی کەفە ژیلکە
کەلاکی شۆڕشگێڕەکان.
لێی بدەن بە بەرد
بهێڵن منداڵان بە دەوریدا هەڵبەزنەوە ..و
زمانیان لە نێو دانەکانییانەوە بێننە دەرێ
با تەنەکەی بە دواوە ببەستن ...و
لە دەوری هەڵپەڕن و قەشمەری پێ بکەن .
کە لە نوێنە خەواڵووەکەم دەریانهێنام
چوون هەڵنیشتنی پەپولەیەك بە سەر گوڵەوە
ئاوا بە سەریا کەوتبووم ...و
هەزارانساڵم هەڵکۆڵین
چوون مێرووولەیەکی بە پشتا کەوتوو
خۆم بە دیوار ....و
ئەڵقە ڕیزی دەرگاکانی ...و
بە ڕیشی پیرەمێردەکان ...و
بە مەمکی شۆڕەژنەکانی گرتبۆوە
بە گریان و پاڕانەوە وە تەماشام دەکرد
وەکو کۆیلەیەکی بە نێزە دەورە دراو
کە لە سروشتی دایکی بڕوانێ .
پێم وت: گلاراومە ئەی دیمەشق
وتی: ئەسرینەکانت بخۆرەوە
وتم :برسیمە ئەی دیمەشق
وتی:پێڵاوەکانم بخۆ
ئەی چی تر ؟
هیچی تر ...ئیتر کەوتمە سەر شۆستەکان و گریام

ئەی ئێستا ؟
ئێستا پێی بڵێن ..هەموو ئەو گۆرانیانەی پێش هەزاران ساڵ گەروویان بەجێهێشت
ئێستا گەشتونەتە کەناری قیسارە
ئەو پەنجانەی لەگەڵ لق و پۆپە زیادەکاندا
لە شورای قەڵا و بورجەکانەوە برانەوە
ئێستا لە پەراوێزی لاپەڕەکاندا کۆبوونەتەوە
دەریاوانەکان لە سەر کەناری دەریاکان کۆ دەکەنەوە
ئەی پیاوەکان...هەموو شتێکی پێ بڵێن
بە ناوی باب و باپیرانەوە
بە ناوی گوربە و سەگەکانەوە
نەك بە ناوی منەوە
من لەگەڵ کێشە دۆڕاوەکاندا هەتا مردن دەمێنمەوە
لەگەڵ لقە سیس بووەکاندا دەمێنمەوە .... تا دەگەشێنەوە
لەگەڵ دیمەشقی پیری وەك رووخسارم
لەگەڵ دەرگا شێدارەکان ...و
کۆکە درۆینەکانی پێش چوونە ژوورەوە لە دەرگا
چۆن بە جێی دەهێڵم ...و
قاچەکانم لە شەقامەکانیدا ڕواون
وەکو ددان لە ناو پووکدا
چۆن لە یادی دەکەم
کە ئەو شوێنی لەسەر پێست و لاپەڕەکانم بە جێهێشتووە
چوون توتن شوێنی لە سەر پەنجەکان بە جێدەهێڵێ :
چۆن هەڵۆ بەسەر بێچوەکەیدا دەڕوانێ
منیش هەموو بەیانییەك بە سەر شەقامەکانیدا دەمڕوانی

ورده زیخێك نییە لە سەر ڕێگەکەی دا
نووکە پێم تێهەڵنە دابێ
بەلووعەیەکی کۆڵانە تەنگەکانی نەماوە
دەمم پێوە نەنابێ
حەسحەسێکی شەوان یان دێوەرەیەك نەماوە
لە مانگە شەوەکانی دا
یەکتریمان نەدواند بێ
کیلۆنێ بە دەرگا کۆنەکانییەوە نییە
بە تەوێڵ و قامکەکانم یاریم پێ نەکردبێ
وەلێ دەرگایەکی کڵۆم دراو نییە
شەوێك کرابێتەوە و پێی وتبم :
بە خێر بێی ئەی غوارەکە
بیدەنە بەر قامچییەکان
لە دەرگاکان ..و لە نێو کتێبەکان و هۆڵەکان و ئاهەنگ و
پرسەکان بیکەنە دەرەوە
هەموو دەرگاکانی جیهانی بە ڕوودا کڵۆم دەن
تا وەك شنە با و وەك خودا تەنها بێت
بەڵام
بەر لەوەی وەها بکەن
چاوەکانم هەڵبکۆڵن
ئەی پیاوەکان ....من خۆشم دەوێ و
خیانەتی لێ ناکەم
ئەگەر چی
وەك وادەی مانگانەی ژنان
فرمێسك لە چاوەکانیشم بڕوات.

# سێبەر و نیوەڕۆ

هەموو مەزراکانی جیهان
دژی دوو لێوی بچکۆلەن
هەموو شەقامەکانی مێژوو
دژی دوو پێی پەتین
خۆشەویستم
ئەوان سەفەر دەکەن و
ئێمەچاوەڕوانی دەکێشین
ئەوان پەتی سێدارەیان هەیە و
ئێمە گەردن
ئەوان مرواریان هەیە و
ئێمەش کرمەك و ژێر چەنە
ئەوان شەو و سپێدە و
ئێوار ە و نیوەڕۆیان هەیە ،
ئێمەش پێست و ئێسقان
ئێمە لە نیوەڕۆ دا تۆ و دەدەین و
ئەوان لە سێبەر دا دەیخۆن
دانەکانیان سپییە چوون دەنکە برنج

دانەکانی ئێمەش کەل و کۆمە   وەك دارستان
سنگیان نەرمە وەك ئاوریشم
ئێمە سنگمان خۆڵاوییە وەك گۆڕەپانی سێدارە
بەڵام هەر ئێمە سەرداری جیهانین
ماڵەکانیان ڕازاوەیە بە گەڵای ڕەنگا و ڕەنگ
ماڵەکانی ئێمەش بە گەڵای پایز
گیرفانی ئەوان پڕە
بە ئەدرێسی ناپاك و دزەکان
گیرفانی ئێمەش پڕە
لە ئەدرێسی هەورە بروسکە و ڕووبارەکان
ئەوان پەنجەرەیان هەیە
ئێمەش باهۆز
ئەوان کەشتییان هەیە
ئێمەش شەپۆل
ئەوان نیشانەیان هەیە
ئێمەش قوڕ و لیتە
ئەوان شوڕا و بانیژەیان هەیە
ئێمەش پەت و خەنجەر
ئێستاش...
با بڕۆین و لەسەر شۆستەکان بخەوین
خۆشەویستم.

*       *       *

# ترسی تەتەرێك

ئەی زیندانیانی گشت شوێنێ
هەرچی گریان و ترس و بێزاریتان هەیە
بۆم بنێرن
ئەی ڕاوچیانی سەر هەموو دەریاکان
هەرچی تۆڕی بەتاڵ و گێژاوتان هەیە
بۆم بنێرن
ئێوەش ئەی جوتیارانی سەر زەمین
هەرچی گوڵ و پەڵاسی شڕتان هەیە
لەگەڵ هەموو ئەو مەمکانەی
ونجڕ ونجڕ کران
لەگەڵ ئەو سکانەی هەڵدڕان
بە هەموو ئەو نینۆکانەی لە بێخەوە
دەرهێنران
بنێرن بۆ ئەدرێسی من
لە هەر چاخانە و شەقامێکی جیهاندا بێ
هەر پێم دەگات
من دۆسیەیەکی گەورە گەورە
لەسەر ئازارەکانی مرۆڤایەتی ساز دەکەم

هەر کە بە لێوی برسییەکان و
بە برژانگی چاوەڕوانی کاران
ئیمزام کرد
بەرزی دەکەمەوە بۆ خودا
وەلێ ئەی سیاچارانی سەر زەمین
زۆر دەترسێم
خودا (خوێندەواریی) نەبێت.

*   *   *

## ئەی گەشتیارەکە

منداڵیم دوورە...و پیرێتیم هەر دوور.. و
مەنفام دوور... و    نیشتمانیشم هەر دوور
ئەی گەشتیارەکە
چاویلکەکەتم بدەرێ
بهێڵە تەماشای ئەو دەستە بکەم
کە لەم گەردوونەدا ئاماژەم بۆ دەکا
پۆرترێتێکم بکێشە...
من بگریم!
بە دەسماڵەکەمەوە
لە بەر دەرگای ئوتێلێکدا
ڕۆنیشتبم ..
بە درێژی پۆرترێتەکە بنووسە
ئەمە شاعیرێکە لە ڕۆژهەلاّت
دەستەسرە سپییەکەت لە سەر شۆستەکە دابنێ ...
لە ژێر ئەم بارانە میهرەبانە دا
بە تەنیشتمەوە دانیشە..
تا نهێنییەکی ترسناکت
بۆ بەیان کەم:

واز لە ڕێبەر و چاوساغەکانت بێنە
فڕێیان بدەرە ناو لیتەوە ....ناو ئاگرەوە
بەو پەراوێز و سەرنجانەشەوە کە نووسیوتن
هەر جووتیارێکی پیر بدوێنی
دو دێر دەردە دڵ و
هەموو مێژووی ڕۆژهەڵاتت
بە دەم پێچانەوەی سیغارێکەوە
لە بەردەم چادرەکەیدا..بۆ دەگێڕێتەوە

*　　*　　*

## ئیشەکانی ماڵەوە

من لە پایزی تەمەندام     و
پیرێتییەکی سپی خۆ لە تەوێڵم دەسوێ
چوون یاسەمینی دیمەشقی
لە هەموو دوڕیانێکدا
کێ گوێ بە من دەدات؟
زەنگی تەلەفۆنەکە لێبدە خۆشەویستم
داوای ترس و ئازاری زیاتر بکە
ئیتر من بێباکم
ئایندەم هەر لە گۆڕەکەمدایە
کۆماری تەنهای من
هەر سێبەرەکەمە
لە ڕێگای بەرەو ئەودا......
نــــــا
داوای قاوەیەك و عەگاڵێکم بۆ بکە     ......و
بیابانێکی بێ کۆتایی
تا بگەڕێمەوە بۆ ڕابوردوو
دۆسیەی فرمێسکەکانم و
ژمارەی ڕوومەتم ئامادە کە

نـــــــا

ناسنامه و دەفتەری ئەدرێسەکانم و
پاسپۆرتەکەشم بدەرێ
لە سەر تەوێڵم هەڵیاندەچنم .....و
چوار مشقی لەناو جەرگەی شاردا
دادەنیشم
چوون سەرەك هۆزێکی کێوی .....و
دەیانگۆرمەوە بە
موورو و ئاوێنە ڕەنگاڵەییەکان
قولاپ لە چەناگەم گیر مەکە
وەك جەستەیەکی ئاوساوو
ڕامکێشی بۆ دەرەوەی شار و
لە یەکێك لە شیوەکانییەوە
غلۆرم کەیتەوە
ئەگەر ئالآی ولآتە شێواوەکەشم
لە سەرەوە
تەماشایەکی کردی
خێراتر بڕۆ
چوون قەرزارێك لای دوکانی قەرزدارەکەیدا

*     *     *

## پاش بیرکردنەوەیەك قووڵ

شەقامەکان دابماڵن
ئامانجێکم نەما هەوڵی بۆ بدەم
هەموو شەقامەکانی ئەورووپام...
لە ناو نوێنەکەمدا تەیکردووە......و
لەگەڵ شۆخترین ژنانی مێژوودا خەوتووم ........و
هێشتا هەر لە سووچی چاخانەیەکدا بووم.
بە نیشتمانە چکۆلەکەم بڵێن..
کە هەر لە پڵنگی بریندار ئەچێ
وەك قوتابییەك پەنجەی دۆشاومژەم هەڵدەبڕم...و
داوای مردن یان سەفەر دەکەم...و
بەڵام ..
لە ڕۆژانی منداڵییەوە
هەندێك سروودی ڕەسەنم لای نیشتمانە....و
ئێستا دەمەوێتەوە
سواری هیچ واگۆنێك نابم...و
هەرگیز ناڵێم خودا حافیز
ئەگەر پیت بە پیت و
خاڵ بە خاڵیم نەداتەوە

ئەگەر نەیەوێت بمبینێ
یان بە بەرچاوی ڕێبوارەکانەوە
خۆی لە قسەم لابدا
با بیخاتە پریاسکەیەکی کۆنەوە و
لەبەر دەرگایەکدا داینێ
یان لە پشت درەختێکەوە
منیش چوون سەگێك هەڵپەمە بیگرمەوە،
مادام وشەی ئازادی لەسەر زمانمە
وەك ئەوەیە لەسەر کورسییەکی بچووکی سێدارە بم
بەو تابووتە بڵێن
کە تا کەناری ئەتڵەسی درێژ دەبێتەوە
من پارەی دەسرێکم نییە
بۆ لاوانەوە...
لە گۆرەپانی ڕەجمکردنی مەککەوە
تا هۆڵی سەما لە غەرناتە
برینێکی شکاون بە مووی سەر سنگ
میدالیاکان هیچیان نەمایەوە...
تەنها ئەڵقەکانیان نەبێ
بیابانەکان چۆڵ بوون لە قەلەڕەش
باخەکان لە گوڵ
زیندانەکان لە هات و هاوار
کۆڵانەکان لە پیادە
هیچ نەماوە جگە لە تەپوتۆز
کە هەڵەبەز و دابەزێتی
وەك مەمکی زۆرانگرێك

**ئەی هەورەکان لێرە بڕۆن**
**چونکە شۆستەکانی نیشتمان**
**ئیتر بۆ قوڕ و لیتەش ناشێن.**

***        *        ***

## هەموو چاوەکان ڕوو لە ئاسۆن

لەو کاتەوەی بۆنی نان
وەکو بۆنی گوڵ دڵبەرە
وەکو بۆنی نیشتمان لە بەرگی گەشتیارەکاندا
من هەموو بەیانییەك قژم شانە دەکەم
جوانترین جل لەبەر دەکەم
پەلەمە…
چوون عاشقێ لە یەکەم ژووانیدا
لە چاوەڕوانی ئەودا…
لە چاوەڕوانی ئەو شۆڕشەدا کە وشکی کرد
پێیەکانم لە چاوەڕوانی ئەودان
چوون خور دەژمێرێ..
دانەکانم دەژمێرم
چوون مۆسیقارێ بەر لە کرانەوەی پەردە
یاریان پێ دەکەم
هەرکە بیبینم ….
تەماشای قامچییەك لە قامچیەکانی
یان گوللەیەك لە گوللەکانی دەکەم
دەستم دەخەمە سەر دەمم ….و

وەکو ژنە لێزانەکان...قریوە و هەلهەلە دەکێشم.....و
سکاڵای لێ دەکەم
برسێتی چەند ئازاری داوم ...و
ترسیش چەندە تەزاندوومی...
بۆ ئێوارەش
دەیبەمە کۆڵانە تەنگەکان...و
گوندێکی دەرپۆقیو
پێکەوە لە ژێر گڵۆپەکانی شەقامەکەدا
دادەنیشین
هەموو شتێکی بۆ دەگێڕمەوە
بە دەم و پەنجە و بە چاوەکانم
هەتا وەنەوز لەسەر پێڵوەکانی دەدات.....و
هێدی... هێدی خەو دەیباتەوە
وەك داپیرەیەك لە بەردەم کوانووەکەیدا
وەلێ گەر نەهات
چوون هەرزەکارێ
قەپاڵ لە دەمارەکانم دەگرم
تا بڕ بکات گەردنم درێژ دەکەم
وەکو ڕیشۆڵەیەك لەو پەڕی قیڕە قیڕی دا
لە خودا دەپاڕێمەوە
ئەم میللەتە قەلاچۆ کات.

*   *   *

## له شه‌ودا

له‌وێدا هه‌نگ ...و  له‌وێدا گوڵاڵه‌ هه‌یه‌
كه‌چی ده‌مم پڕ ده‌بێت له‌ تاڵی
له‌وێدا نوكته‌ و ئاهه‌نگ و گاڵته‌چی هه‌ن
كه‌چی دڵم پڕ ده‌بێت له‌ شیوه‌ن و گریان
تۆ ئه‌ی پاسه‌وانه‌ پیره‌كه‌..ئه‌ی باپیره‌م
تانجییه‌كه‌تم بده‌رێ با سۆراغی خه‌می خۆم كه‌م
فانۆسه‌ كاره‌باییه‌كه‌تم بده‌رێ
با به‌ دوای نیشتمانه‌كه‌مدا بگه‌ڕێم
له‌و كۆڵانانه‌وه‌ دێم بۆ لات ..
كه‌ وه‌ك قامچییه‌كانی باپیره‌م درێژن....و
لای ئه‌و هاواره‌ یه‌ك له‌ دوای یه‌كانه‌وه‌ له‌ گه‌رووم‌دان...و
له‌ سه‌وڵ ئه‌چن
ئه‌ی ته‌پوتۆز و خه‌ڵكه‌كان شكایه‌تتان لێ ده‌كه‌م
ئه‌ی شه‌و و گوڵ و مۆسیقا شكایه‌تتان لێ ده‌كه‌م
تۆش ئه‌ی شه‌قامه‌كه‌ هه‌ر شكایه‌تت لێ ده‌كه‌م:
هه‌ركه‌ چیرۆكه‌كه‌م ده‌سپێكرد
وه‌كو مار...به‌ كۆڵانه‌كاندا فیشكه‌ی هات...و
به‌ ته‌نیا به‌ جێیهێشتم...

قاچەکانم چوون لە سێدارە دراوێ لە هەوادا دەلەرینەوە.
لەبەر ئەوەشە..چوون شەمشەمە کوێرەیەك بە باڵە کوتێ بۆ لات هاتووم
نازانم ئەمشەو لە کوێ بەسەر بەرم
ئەو شۆستانەی گوزەریان پێدا دەکەم
هەنگاوەکانم چوون دەرمانی تاڵ حینجە دەکەن
ئەو دیوارانەی دەستیان لێ دەدەم
لە ژێر پەنجەکانمدا...
چوون لێوی پێشناڵین دەلەرزن
ئیرەیی بە بزمار ئەبەم
چونکە تەختەیەك هەیە لە خۆی دەگرێ و دەیپارێزێ
خەنی دەبم بە جەستەیەکی لەت لەت بووی بیابان
چونکە قەلەڕەش لە دەوری باڵە فڕەیانە و دەقیڕێنن
ئاهـ...باپیرەم
چەند تامەزرۆی ترس و ستەم بووم
تامەزرۆ بووم خۆم بە لقی درەختێکەوە..
بە سەیارەیەکدا هەڵواسم
یان دەست بگرم بە هەر شتێکەوە
ئەگەر چی شووڵەکانی زیندانیش بێ
وەنەبێ من هەر ون بووبم
ئەگەر لە چاخانەیەکدا لە سەر کورسییەکم بکەوم
بە هەزاران ساڵ ناکەومە سەر زەوی.

*   *   *

# هەتیو

ئاهـ …
خەون……خەون
گالیسکە ئاڵتوونییە تۆکمەکەم….شکاو..
تایەکانی وەکو قەرەج
بە هەموو شوێنێکدا بڵاو بوونەوە.
شەوێك خەونم بە بەهارەوە بینی
کاتێ بە ئاگا هاتمەوە
سەرینەکەم بە گەڵا و گوڵ داپۆشرا بوو
جارێك خەونم بە دەریاوە بینی
بۆ سبەینێ
نوێنەکەم پڕ بوو لە سەدەف و پولەکەی ماسی
وەلێ کە خەونم بە ئازادییەوە بینی
نێزەکان لە دەوری گەردنم …بە وێنەی مانگ خەرمانەی دا
لەمڕۆ بە دواوە نامبیننەوە
لە بەندەر و فارغۆنی شەمەندەفەرەکاندا
یان لە کتێبخانە گشتییەکاندا
دەمبیننەوە
لەسەر نەخشەکانی ئەوروپا بە خەوتویی دەمبیننەوە

وەکو خەوی هەتیوێك لەسەر شۆستە
چونکە لەوێ
دەمم زیاتر لە ڕووبارێك تام دەکات ······و
ئەسرینەکەشم کیشوەر بە کیشوەر دەڕوات

*        *        *

# خاڵ

ئێستا
کاتژمێر سێی سەدەی بیستەیەمینە
لەم کاتەدا
هیچ شتێك کەلاکی مردوو لە پێڵاوەکانی ڕێبوارێك جیا ناکاتەوە
جگە لە قیری سەر شەقام
لە ناو جەرگەی ئەو شەقامەدا وەك لادێییە پیرەکان
شان دائەدەم و
هەڵناسم
تا هەموو شیشە ئاسنینەکانی زیندان و
دۆسیەی دۆسیەی گومانلێکراوانی جیهانم
بۆ کۆ دەکەنەوە و
دەخرێتە بەردەستم
منیش لە سەر ئەو راستە ڕێگایە
وەکو وشتر هەر کاوێژ دەکەم و
دەیجووم
هەتا دار لە دەستی پۆلیس و
خۆنیشاندەران

لە دەستەکانیان هەڵدێت و
جارێکی دی دەبنەوە بە لقی گوڵێك
لە نێو باخچەکەی خۆیدا
من لە تاریکیدا پێدەکەنم
لە تاریکیدا دەگریم
لە تاریکیدا دەنووسم و
قەڵەم و پەنجەکانی خۆم بۆ جیا ناکرێتەوە٠
هەر کاتێك لە دەرگا دەدرێت
یان پەردەی بەر دەرگا دەلەرێتەوە
ئیتر بە دەستی خۆم کاغەزەکانم دەشارمەوە
وەك هەڵهاتوویەك لە ساتی گیراندا ٠
ئەم ترسەم لە کوێوە بۆ ماوەتەوە
ئەم خوێنە ترساوەی وەك شێری کێوی
کە هەر کاغەزێکی رەسمی لە سەر سەکۆی بەر دەرگا دەبینم
یان هەر کڵاو و تەپڵەیەك لە درزی دەرگاکەمەوە
ئیتر ئێسقان و فرمێسکەکانم پێکدا دەدەن
خوێنەکەشم بە ترسەوە بە هەر چوار لادا رێچکە دەگرێ
وەك دەستەیەك لە پۆلیسی نهێنگر
خوێنبەر خوێنبەر دوای کەوتبێ ٠
ئای خۆشەویستم ...
بێهوودە ئازایەتی و بەجەرگیم دەگێڕمەوە
کۆست کەوتن لێرە نییە
لە قامچی قوتابخانە و زەنگی بەرپا بوونی جەنگ ..
لە بێشکەدا ...
لە مناڵدان... دایە

ئەوەشی لە منالّداندا پێیەوە بەسترابووم بووم
وێلاّش نەبوو
بەلّکە پەتی سێدارە بوو٠

*　　*　　*

# نەقیزەوان

ناو : مێرووولەیەك
ڕەنگ : پەڕیوتر لە تۆقین
ناوچەوان : لە قوڕ دایە
شوێنی دانیشتن : گۆڕستان یان دۆسیەکانی ئامار
پیشە : نەقیزەوان
شمەك : خۆڵی ئاڵتون و ئاسمانێکی شین ٠
کرێوەکان و کەناراوە بڵندەکان کە چاو نایگاتێ
بۆ مەلەوان و نەخشە دانەران
من خۆڵم بۆ گوندەکان پێیە
فرمێسك بۆ منداڵان
پێچ بۆ کۆڵانەکان
بەردیش بۆ پەیکەر و داپڵۆسینی خۆ نیشاندەران
باوکانم بۆ سەرزەنشت کردن پێیە
من بیرم پێیە بۆ شکایەت
دایك بۆ سۆز
شەقام بۆ فرۆشتنی گوڵەکان
دارستانم پێیە بۆ دروستکردنی کەشتی و

گومەزی و راستە داری ئاڵاکان
من بەفرم پێیە بۆ چۆلەکە و
پایز بۆ دارستان
کۆکە بۆ کۆڵان و
دەلاقەی بەرز بۆ بانگی فرۆشیار و
بۆ هاوکاری و یارمەتیدان
من هەموو شتێکم پێیە بەڕێزان
مشاری دار
تەنەکەی خاڵی
من نەتەوەم لایە
نەتەوەی هێمن و خەوتووی وەك دارستان
دەشتوانی بەکاری بهێنی
لە چاخانە و شەڕ و جەنجاڵی ڕێگادا
خێرا کەن بەڕێزان
وا خەریکە شەو دادێ و
دەبێ ئەم شتانە ساغ کەمەوە
پێش خۆر ئاوا بوون
جزدانەکانتان دەربێنن و
ئەم نرخانەم نەتانترسێنێ
هەموو فەتحە عەرەبییەکان
دەگۆڕمەوە بە چەرپایەك
گشت ئەستێرەکانی خۆرهەڵات
بە دەنکێ شقارتە
تا بچمە لای نزیکترین بەردهاوێژێك
یان هەر بزمار فرۆشێکی ئەم نیشتمانە

منیش وەك دەنووكی لەقلەقێك
بیکەم بە سنگمداو
بمرم

*　　*　　*

## ترس

دایکە
ئەی خاوەن سنگە ڕەنگاڵەییەکەی
وەك کۆلێتەکانی ئەفریقا
خێراکەو بگە فریام
وەرە و
لەو فەقیانە قووڵە لادێیانەی خۆتدا
لەگەڵ دەرزی و دەزوو و قۆپچەکاندا
بمشارەوە
مەرگ لە هەموو لاوە تەنگی پێهەڵچنیوم
ئاسمان تاریك دەبێ و
ڕەشەباش زەرد زەرد
سەگە ڕەشەکانیش
کتێبە خوێناوییەکان لە
جانتای ڕێبوارانەوە دەردێنن
دەترسم لەم ڕۆژگارە تاریکەدا
بەیانی یەك لە خەو ڕابم و
باڵندە نەبینمەوە بەسەر دارەوە

یان گوڵێك لە سەر شێوەی  خۆی
یان هاوڕێیەك نەبینمەوە لە چاخانە
ئەترسم...
بەیانی یەك خۆم كۆكەمەوە و
بچمە بەردەم شێوار[1]ەكە یان ئاگردانیماڵەوە
گوللە ئاژنم بكەن و
هێشتا فڵچەی جان شۆرینەكە
لە دەممدا بێت...
تكات لێ دەكەم دایكە ......خێراكە...
لە ڕێگەكەتدا ...لادە لای دار بڕ و خێڵە كۆچەرییەكان...
پرسیاریان لێ بكە دەربارەی (جلێك) ی پێستە
لە بارەی هەر (گیا و گوڵێكەوە)
لەم ترسە بمپارێزە:
دەچمە سەر ئاو ....و
كاغەزە ڕەسمییەكانی خۆم پێیە ......
لە چاخانە دێمە دەرێ ...و
بە ڕاست و چەپ
چاو دەگێرم...
تەنانەت خونچەی بچووكیش
پێش ئەوەی دەم بكاتەوە
بە ڕاست و چەپی خۆیدا
دەڕوانێ...
ئای دایكە ...
ئەگەر هیتلەر هەر وەكو خۆی
وێنەكێشی بكردایە

وە ماركسیش لە تەنگەرەی منداڵیدا
بمردایە
ئەگەر لویسی شازدەیەم
زیاتر هێز و پیاوەتی خۆی
دەرخستایە
ئەگەر ماری ئەنتوانێت
هێندە دڵبەری و خۆ گەورە بوونی
نەبوایە
ئەگەر قەڵاكانی باستیڵ
لەسەر خاكی قاسیۆن
هۆڵی پاریس لە سەر شۆستەی دیمەشق بایە
ئەگەر رۆژهەڵات كا دەبوو
رەشەباش بەهێزتر و لێزانتر با
ئەو كاتەی كە رۆما سووتا
ئای ئەی دایكە
گەر ئازادی بەفر بوایە
تا هەتایە
بێ پەنا و پەسێو دەخەوتم

* * *

## گەشتیارێکی عەرەب لە کەشتیەکانی ئاسماندا

ئەی زانایان و پیشەوەران
پاسپۆرتێکی ئاسمانم بدەنێ
من نوێنەری وڵاتە غەمگینەکەمم
بە ناوی بێوەژن و پیر و منداڵەکانی یەوە هاتووم
تا پاسپۆرتێکی بەلاشم بدەنێ بۆ ئاسمان
لە جیاتی پارەش من فرمێسکم پێیە
گەر جێگاشم نەبێتەوە
بمخەنە دوای کەشتییەکەوە
یان لە سەری
من لادێیم و ڕاهاتووم
ئازاری ئەستێرەش نادەم
خراپەشم بۆ هەور نابێ
ئەوەی تەنها من دەمەوێ
زۆر خێرا بگەم بە ئاسمان
تا قامچییەك بدەمە
دەستی خوا
بەڵکو هانماندا بۆ شۆڕش.

## بۆ بەدر شاکر سەییاب

ئەی هاوڕێی تەنهایی و پیاسەکانم
غەمەکانم دوور و درێژە  چوون داری قەڵەم تۆز
چونکە ڕانەکشاوم بە تەنیشتەوە
بەڵام هەر دەبمە میوانت
کفنە سپیەکەشم وەك ژنانی مەغریبی دەدەم بە سەرما
هیچ چرایەکیش لە سەر قەبرەکەت دامەنێ
خۆم ڕێگە دەردەکەم
چوون مەستێك پێکی خۆی بناسێتەوە ...و
یان مەلۆتکەیەك بۆ مەمك .
کاتێك لە نیوە شەودا
دەستەکانت بەرز دەکەیتەوە  و
لەم دەرگا یان ئەو دەرگا دەدەیت  و
تۆش دەفتەرێکی کۆنت هەڵگرتووە
بەرگەکەشی چوون پەڕ و باڵی پەپولەیەك
لێ بۆتەوە
تۆش لە یادەوەرییە ماندووەکەتدا
ئەم ڕستە یان ئەو ڕستە یاد دەکەیتەوە
تا لەمەڕ ئاگردانەوە

بۆ ئازیزانتی بگێڕیەوە
پاشان دەنگێك لە قووڵایی شەوەوە
دەقیژێنێ :
هیچ کەس لە ماڵەوە نییە ..
کەس لەسەر ڕێگاکان نییە
کەس لە جیهاندا نەماوە
پاشان سەر وەردەچەرخێنی و
لە نێو چڵپاوە بۆگەنەکانەوە دەڕۆیت.....
بە ناو ئەو دەرگایانەی کە هێندە توند دادەخرێن
گەچی سەر دیوارەکانی دەوەرێت
تۆش لە داهاتووت دڵنیایت
کە جمەی دێ لە شەوگارە دڕندەکان
ئەو دەنگەشی کە دەیقیژاند
هیچ کەس لە ماڵەوە نییە
کەس لە سەر ڕێگاکان نییە
کەس لە جیهاندا نەماوە
ئەی تۆ
عەبایەکی ڕەش دەدەی بە سەر
نیشانەکانی مرور و بانگیان لێ دەکەی
دایە گیان
لە سەر پاکەتە خاڵیەکانی جگەرە
وێنەی درەخت و ڕووبار و
مناڵە دڵشکاوەکان
دەنەخشێنی و
بانگیان دەکەی

نیشتیمانم !
وەلێ چ نیشتیمانێکە ئەمە ؟
کە لە نیوەی شەودا کەنناسەکان
بە زبڵەکانەوە ڕایدەماڵن
بە مردنی خۆتەوە ئارام بگرە ئەی گەمژە
بە بەرد و دار و چڕنووکەوە بەرگری لێکە
دەتەوێ بێیتە دەر و
چی ببینی ؟
کتێبەکانت لەسەر شۆستە
هەڕاج دەکرێن
گۆچانەکەش بە دەستی نیشتیمانەوەیە
ئەی غەمگین لە مردن و ژیانی خۆت
گۆڕەکەشت هێواشە وەك کیسەڵ
هەرگیز بۆنی بەهەشت ناکات
بەهەشتیش بۆ
دوژمنکار و
پاسکیل سوارانە ٠

* * *

## به ئەدەبێك لە چاخی دڕندەیی دا

وەك قولە ڕەشێكی خەوتوو
رمەكەی بە دەستەوە
لە نێو ئەم جەنگەڵی بەردەدا
دەمێنمەوە
لە چاوەڕوانی شتێكدا
بڵێی لەم غاباتی ڕۆحە پاكیزەیەی تۆدا
پەلێكی لە خۆبردوو
بدۆزمەوە
بۆ باڵدارێكی بریندار كە ناوی.... دڵمە ؟
ماچ بارانت دەكەم
وەك كێلی قەبرەكان
وەك درەختێك لە بەهاردا
لە نێوانی هەر ماچێكدا
بە سوپاس و مەمنونییەوە
تەماشایەكی ئاسمانیش دەكەم
چوون چۆلەكەیەكی تینوو
ئاوێك بخواتەوە لە دۆلكەیەكدا

ڕوخساریشم لە نێوان مەمکە
بەسۆزەکانتدا ون دەکەم
وەك دەشتەکییەك کە بانگی هۆزەکەی دەکات
هاوار دەکەم
ئەی ئەو کۆترەی کە دێیتە سەردانم
باڵەکانیشت بەسراون وەك ............
بەس لە ناو لەپم ڕامێنە
بەس بە دوای خەتی عومر و بەخت و داهاتووما
بگەڕێ
هەمووی سراوەتەوە لە هەڵگرتنی جانتاکان ...و
ڕاکێشانی قەڵاکاندا لە .....( خەون) دا
تۆ بێ هوودە بە دوای نهێنی خەمەکانمدا
دەگەڕێی
بە ناو کتێبەکانی مەکتەب ...
یان لە هاوڕێکانی
چاخانەم دەپرسی
غەمگینی من کەسی نییە و
کەس ناناسێ
وەکو شەقام
وەکو کۆرپەیەك وەهایە
لە شارێکی سۆزانی دا
لە دایك بێ .

*   *   *

# پەیامێك بۆ لادێ

لەگەڵ چەهچەهەی بولبەل و
جریوە جریوی چۆلەکەدا
خودا دەکەم بە تکاکارو
دەڵێم باوکە :
وازبێنە لە کۆکردنەوەی زانیاری و
ئاشنایی لەسەر من
وەرەو
پارچەکانم لە خیاباندا
کۆکەرەوە
بەر لەوەی رەشەبا
بمکات بە ئاردی ناو درك
بەرلەوەی کەناسەکان پاکمکەنەوە
ئەم قەڵەمە هەر دەمکوژێت
زیندانێك نەماوە بە هۆیەوە
تێی نەچووبم
شەقامێك نەماوە بە هۆیەوە
نەمگەوزێنن

منیش وەك سیحر گرتوویەك
دوای دەکەوم
وەك ئەوەی لە خەوندا بم ........دەڕۆم
ئەم ئێوارەیە ......باوکە گیان
ئێوارە ساردەکانی دیمەشق
کە ساردە وەك قووڵایی زەریاکان
کەسێ بە دوای مەیخانەیەکدا دەگەڕێ و
یەکێ تریش بۆ پەناگا
منیش بۆ وشەیەك
دەگەڕێم
بۆ پیتێ لە بەرابەر
پیتێکی تردا دایبنێم
وەك پشیلەیەکی پیر
کە بدا لە دیوار بە دیواری
گوندێکی دارماو
پشیلەیەك بمیاوێنێ و
بگەڕێ بە دوای بێچوەکەیدا
بەڵام....
وا دەزانی من دڵخۆشم
ئەی باوکە گیان ؟
هەرگیز .........هەرگیز
چونکە زۆر جار هەوڵمداوە
قەڵەمەکەم خاڵی کەمەوە لە ئاوێت(١)
وەك پاککردنەوەی خەنجەرێك لە خوێن
وە ئەم شارەش بەجێ بێڵم

گەرچی لەسەر دیواریش بێ
بەڵام هەر ڕەنج بەخەسار بووم
ئەم قەڵەمەم بۆنی ئاوێت دەکا
چوون بۆنکردنی نێرینەیەك بە مێیەوە
کە هەر پەڕەیەکی سپی دەبینێ
ئیتر دەکەوێتە لەرزەو
دەوەستێ
وەکو دزێك لەبەر پەنجەرەیەکی کراوەدا
دواتر دەخەوم
هیچ شتێك بەسەر جێگەکەمەوە نامێنێتەوە
جگە لە پێستەکەم
کەللەسەرم دەروا بۆ زیندان
پێیەکانم لە کۆڵانن
دەستەکانیشم لە هێلانەیەکدا جێدەمێنن
چوون ماسییە گەورەکەی سانتیاگۆ
تەنها پەراسوو و چاڵی چاوم ماونەتەوە
ئیتر لە بیری خۆت دەرم کە باوکە گیان
بگەڕێوە لای گاسن و
گۆرانییە غەمگینەکانی خۆت
ئیتر من پێوە بووم
سبەینێ هەموو شتێ مەحاڵ دەبێ
وەك گرتنەوەی خوێن بەربوونێك بە پەنجە .

## زستان

وەکو گورگێك لە وەرزە وشکەکاندا
ئێمە لە هەموو شوێنێکدا دەڕواین
بارانمان خۆشدەویست
پایزمان دەپەرست
تاکو ڕۆژێك بیرمان کردەوە
سوپاسنامەیەك بنێرین بۆ ئاسمان
لە جیاتی پوولیش
گەڵایەکی پایزی لێ بدەین
دەمانزانی کە چیاکان هەر دەڕوخێن
دەریاکانیش وشك دەکەن
شارستانییەکان لە ناو دەچن
تەنها خۆشەویستی دەمێنێتەوە
لەناکاو دا ..جیا بووینەوە
ئەو حەزی لە کورسی قەنەفە درێژەکان دەکرد
منیش لە پاپۆڕە درێژەکان
ئەو عاشقی چرپە و حەسرەتەکانی چاخانە بوو
من عاشقی قەڵەمباز و

هاوارەکانی نێو شەقام بووم
لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا
باڵەکانم بە درێژی هەموو گەردوون دەبێ
لە چاوەڕوانی دا .

* * *

# جەنگەڵ

وشەكانیماڵئاوایی ئیغرامان دەكا....ئیغرا
ئیغراكردنێك...
وەكو پێكێكی ژەهراوی دەست سەرۆكێكی گەڕۆك
بەڵام هەر دەمكووژێ خۆشەویستم
ئەو پێكە دەدات لە سەرم
چوون لێدانی پرشە ئاگری دیواری بوركان
من دەڵێم ڕۆشت
دەبا بڕوا
ئەو خۆ نەمر نییە
لە كوشتارگە و شارستانییەكان
بەڵام
هەر خۆم دەپێچمەوە و
دەمەوێ هەڵێم
خۆشەویستیت ......
وەكو باڵی مردووییەك دەمگرێت
وەكو پەردە تاریكەكانی ناو
فلیمی ترسناك

کێیە هەموو ئەم دەرگا و پەنجەرەیەی لەسەر داخستم
لە چۆڵەوانی پێدەشتێکدا
بەتەنهایی خوێنەکەشی بە جێهێشتم
وەکو کوتکەیەکی سوور
لە دەمارەکانی بەشەریەتدا دەوەرێ؟
تۆ ؟
کێ بوو ماچ بارانی دەکردی ؟
بە شیعر و فرمێسك و بە قامچی لێدان ........من.
من و تۆ ئەی خۆشەویستم
دوو داربڕی هاورێ بووین لە جەنگەڵێکی غەمهێندا
هەریەکەمان بە تەورێکی
تیژی وەکو لێواری شمشێر
درەخت دوای درەخت
پەل لە دوای پەل
هێنامانە خوارێ
بە بێ ئەوەی پێ بزانین
ئەو جەنگەڵە
خۆشەویستی خۆمان بوو.

* * *

# زێدەیی مرۆڤایەتی

من ئەو کەسەم
تاکو ئێستا هیچ شتێکم نەکوشتووە
لە جەنگدا
یان بومەلەرزە
یان لە ڕووداوەکانی هاتوچۆدا
ئیتر چی لە ژیانم بکەم
بەو ساڵانەی کە شەپۆل ئەدا لەبەر چاوم
چوون شەپۆلی دەریا بەرابەر قەلەپاچەیەك
پاش ئەوەی بەهاری وشەکانم بەسەرچوون
لە ناردنی نامە و
داواکردنی بەزەیی و
وێنەکاری داهاتوومدا
وەك وێنەکردنی مراوییەك لەسەر بۆردی قوتابخانە
ئایا وەك کوێر خەونەکانم بە چرپە و دەست لێدان
دەربرم؟
یان بهێڵم وەك بنێشتە تاڵەی درەختەکانی ئێستیوا
بە لاچاوما بێنە خوارێ

ئەی کلاو ڕۆژنەکان
تۆزێك هەوای ئەو سەوزاییەم پێ بدەن
وا دەخنکێم
سیەکانیشم هاتوونە دەرەوە لە سنگم
وەکو دووچاوی هەتیوان
دەنگەکەشم وەکو چەخماخە ون بووە لێم
نە هیچ نەوەیەکی داهاتوو دەناسێ
تاوەکو گۆرانی بۆ بڵێ
نە هیچ دەم و زمانێکی کۆنیش
تاکو بگەڕێتەوە ئامێزی.
ئەی وەستاکان
بەردێك بخەنە نێوانمەوە
من وا درز دەبم
وەك هەڵچنینی دیوارێك فێڵی تێدا کرابێ
دادەڕوخێم
وەك لوتکە بەفراوییەکانی
ژێر هەتاوێکی بەهاری .
ئاخ.........خۆزگە نیشتمانەکانیش دەگۆڕان
وەك بردنەوەی سەماکەرێك لە نێو بارێکدا
بۆ شەوان.

*　　*　　*

# تەنانەت پەل و پۆکانیش دەلەرزن

چوون قەلەڕەشێکی پشت هەڵکردوو
هاوار دەکەم خۆشەویستم
ئەگەر ئەمشەو چراکەی خۆتم نەدەیتێ
باڵەکانیش لە پیریمدا
نوێنەکەشت لە زەمهەریردا
پاروەکەشت لە برسێتیدا
ئەوا دەمانچەکەم پڕ دەکەم لە فرمێسك
نیشتمانەکەشم بە هاوار.
گەر باڵێك و زریانێکم نەدەیتێ
تا پێی بڕۆم
گۆچانێکیش لە درەختی سنۆنۆ
تاکو بگەڕێمەوە
تەنانەت پەل و پۆ بەرزەکانیش دەلەرزن
کاتێك تەماشایان دەکەم و دەگریم
ئاخ......خۆزگە ڕۆژگارەکانی دادێ
لە ڕۆح و پەنجەکان و چاوی دەبردم
چوون بردنی لێوی چەقۆ بۆ میوەیەك

پایزیش بۆ لق  و پەلەکان
بۆئەوەی جیهان بسووتێنم و
لە خۆڵەمێشەکەی
کفنێك بۆ پاسکیلێکی بچووك دروستکەم
کە دەیناسم
بزمارێکی غەمگین بۆ نیشتمانێکی کۆن
کە دەیپەرستم ۰
من ۰۰۰سی ساڵە
کۆرپەیەکم ڕانەژەندووە
کەناری دەریایەك نەیبردووم
داوێنێکم نەگرتووە
لە کۆڵانێکدا نەگریاوم
من۰۰۰۰۰۰۰۰۰۰سی ساڵە
ئاڵای وڵاتەکەم نەدیوە تەڕ بێ بە باران
بەڵام لە زەمهەریردا فوو لە دەستم دەکەم  و
بە گۆرانییەوە  :
نیشتیمانم۰۰۰۰۰۰۰۰۰۰۰نیشتیمانم ۰

*  *  *

# گریانی پەڕەسێلکە

ئەی ئەوانەی لە پشتەوە
خەنجەری ژەهراویتان لێدام و
من نوقمی نێو کاغەزەکانم بووم
پیرێك لەسەر بەرماڵەکەی
مار و گورگ هەرگیز نابنە دوو کۆتری ژێر باران
باران بۆ منە
باران و چەخماخە و شنەباو و شەقامەکان
هی منن
بۆ ئەمەش من پەیامی ئاسمانم پێیە
بەڕاستی
ئێوە بە ژێر باراندا ڕۆشتوون ؟
بەسەر شەقام و خیابانەکانی مندا
پیاسەتان کردووە
ئیتر من لە ئەمڕۆ بەدواوە بارانم خۆش ناوێ
نە باران و .........نە شنەبا
نە مانگ و ......... نە بەردەلان
ئیتر گەلەکەم خۆش ئەوێ

ئەی گەلەکەم لە ئامێزتم بگرە
هەر تۆ باوکێکی دانایت و
منیش منداڵە گومڕاکەت
تۆ تەوژمە بڕەوەکەیت و
منیش کوخی لەبەریەك دارزاو
دەرفەتێکی ترم بدەرێ و
منیش چاوەڕێ دەکەم
ئیتر کرێکار و جوتیارەکانی تۆم خۆش دەوێ
شانازی دەکەم بە ئەسپ و
قوڕ و چڵپاوەکەشتەوە
ناوچەوانمی پێ ڕەش کەم
وەکو جەنگاوەرێکی هیندی ۰
بۆ سڵاوی ئاڵاکەشت
هەروەکو پەیکەرێ دەوەستم
لە خۆپیشاندانەکاندا
وەکو شێتێك دەقیژێنم
بەڵام دڵت ڕەق نەبێ بەرامبەرم
ئەی گەلەکەم
بۆیە من تۆم بەجێهێشت ......
چونکە تۆش بەجێتهێشتبووم
بۆیە من تۆم لەبیر کرد
چونکە تۆش لە بیرت کردبووم
بە گشت شکۆ و مەحرەمێك من سوێند دەخۆم
هیچ ڕۆژێك تۆم لە بیر نەچوو بوو
کاتێ غەرقی خەفەت و چەلەحانێش بووم

غەرق بووم لە نێو دڵتەنگی و جلە ئابڕووبەرەکاندا
من دڵم لای مەڕە لاوازەکانیشت بوو
لای نەخۆشە هەڵچنراوەکانت لە ڕارەوەکاندا
من جگەرەم بۆ میوانەکانت دادەگیرسان
لە ئاهەنگەکانتدا پێدەکەنیم و بە پشتدا دەچووم
من بیرم لە گوندە قوڕاوییەکانیشت دەکردەوە
بیرم لەو پیرانەت دەکردەوە
کە لە سێبەری چراکاندا لارەیان دەهات
دە وەرەوە
خراپ لێکتر تێگەشتبووین
با پەنجەکانی خۆمان بریندار کەین
هەرچۆن گونجا
با دڵپێك لە خوێنی یەکتر بخۆینەوە
با ببینە برا
با ئەسرین و غەمەکانمان وەك پارەی دزراو تێکەڵ کەین
با بەتەنها بڕۆین
دژی زەمەن
دژی باهۆز
شوێنی زامەکانیشمان لەسەر ناوچەوانمان بجوڵێ
وەکو میلی سەعاتەکان.

* * *

# گرد

له من مەدە
ئەی چارەنوس
له سەر ڕووخسارم چەند مەترێکم بۆ مەنووسە له لێدان
لەسەر شەقامەکانیش باهۆز هەڵدەکا
من له کتێب و باڕ و فەرهەنگەکان دێمە دەرەوە
چوون هاتنە دەرەوەی دیلەکان له خەندەق
ئەی ڕۆژگاری هیچ و چوچی وەك مێرووله
ئەی ئەوەی چاوت دابەستم بە گێژەڵووکە له جیاتی ڕەشەبا
بە کزە ئاگر له جیاتی بورکان
دڵنیابە لێت خۆش نابم هەرگیز
هەر دەگەڕێمەوە گوندەکەم ئەگەر بە پێیانیش بێ
هەر کە گەشتم لەسەر تۆ پڕوپاگەندە پەخش دەکەم
لەسەر گژو گیا و کەناری لقی درەختەکان
ڕادەکشێم
وەك جەنگاوەری پاش شەڕێکی هێز پڕوکێن
چوون پەڕینەوەی سەگە ڕاهێنراوەکان
له بازنەکانی ئاگردا

له ئەم دەرگا و پەنجەرانەوە
لە ئەمروپۆش و یەخە داخراوانەوە دەپەڕمەوە
چوون هەڵۆ بەرز دەفڕم
بە سەر نهێنی پاکیزەکان و ئازاری کرێکاراندا
باڵەکانم دەکەمەوە چوون سنۆنۆ لە زەردەی ئێواراندا
بە دوای زەوییەکی پاکدا دەگەڕێم
کە ڕێکەوتی کوخ یان کۆشکێك
پاشا یاخود گەدایەکی کرد
لە ئاسماندا سەربڵند دەوەستێ
وەك ئەسپێکی کێوی کە بکەوێتە پەرژینێکەوە
زەوییەك نەبووە و نادۆزرێتەوە
تەنها لە دەفتەرەکانی خۆمدا نەبێ
باشت کرد ئەی ڕۆژگار
بەراستی بۆرت دام
بەڵام لەم هەموو ڕۆژهەڵاتـەدا
شوێنێکی بەرز نادۆزمەوە
ئاڵای تەسلیم بوونی خۆمی لێ بچەقێنم ٠

*  *  *

## یادی ڕووداوێکی دڵتەنگ کە هێشتا ڕووی نەداوە

کاتێك لە ژێر داری
گوڵەباخەکاندا پیاسەم دەکرد
یادگاری و نێرگەلەکەشم پێ بوو
چوون پاڵەوانێکی پیر لە مەنفا و
ناو چیمەنەکەیدا دانیشتبێ
تەماشام کرد
ئەوان لە نێو کرێوە بەفراوییەکاندا ڕادەکەن
نیوەیان پاڵتۆیە و نیوەیان چارشێو
بە پێڵاوەکانیان وەکو گولله
قور هەڵدەدەن
هەریەکەشیان دەستیان بە سەر سەریانەوەیە و
هاوار دەکەن :
فریامان کەون ....فریامان کەون
من دەفتەرم
من شۆڕشگێرم
من نووسەرێکی دادوەرم

من تەلەفۆنم
من تەتەر بووم
منیش لەسەر دیوارەکانی شار دانیشتبووم
چوون پەیژەی ئاگر کوژێنەوە
شمشێرەکەشم هەتا مشتوو
چەقاند بوو
لە برِبرِەی پشتی قەڵای باستیڵدا

*　　*　　*

## فڕۆکەی شمشێرەکان

له شارەکاندا
پانکە و ساردەمەنی
بەکار دێنن
ئەی له بیاباندا چی دەکەن؟
جگە له چاوەڕوانی باهۆز ؟
بەڵام ئەی باهۆز له کوێیە؟
نە قەڵا سپییەکان دەزانن و
نە ئاڵا پوتورکاوەکانی سەر گردەکان
باهۆزەکە لەوێیە
دوو دڵە و له پشت ئاسۆ دوورەکانەوەیە
وەك سۆزانی یەکانی بەر دەرگای هۆتێڵ
هەڵۆیەکی پیریش
دواترین هەڵۆ له مێژوودا
له دەرەوە وەکو شۆفێری ئەسپەکان چاوەڕێیە
بڕۆ بۆ لای
ئەی هەڵۆ پیرەکە
بەس له پاشماوەی هەور و گێژەڵووکە لماوییەکان
بخۆوە...وەك ئاشپەزێکی کۆن

پێدەچێ باهۆز جوانی خۆی نەدۆڕێنێ
تا چەند نەوەیەك بەڕێ دەكا...
هەڵۆ پیرەكە چۆن دەڕوا بۆ لای
كە دەنووكی وەكو نوكی پێڵاو
دارزاوە..
چۆن خێراتر دەڕوا
كە وەك پاسكیلێكە لارەی بێ و
بە ڕووباردا بپەڕێتەوە.
ساڵ لە دوای ساڵ
پەڕی سپی سەر سنگی پیس دەبێ
وەكو دەسماڵی كارەكەر
نەوە دوای نەوە
شنەبا وردیلەكان پاڵی پێوە دەنێن
لەم بەردەوە بۆ ئەو بەرد
لەم پێدەشتەوە بۆ ئەولاتر
ئەویش .......... و تەسلیمی بووە
چوون سۆزانییەك لە سەربازگەدا.
حەزی لە جەنگێكی ترە
لەگەڵ چارەنووس
لەگەڵ باهۆز
لەگەڵ ( مێشوولە) دا
بەم چڕنووكە خووراوانە و
ئەوەی دەنووكی خەریكە ڕێك دەبێتەوە
ئەوەندەی كێشاوە بە بەردا.
لە ساتەكانی یادگاریدا :

ئەو ساتانەی گوزەریان کرد
هەڵۆکە چوون باوکێکی ڕۆژهەڵاتی
باڵەکانی خۆی لوول دەکرد و
چوون چارشێوە نەخشینەکانی لادێ
دەیکردنەوە ... و
بەسەر شار و کیشوەرەکاندا
باڵی لێدەدا
هەور و باڵندە چکۆلەکانیش
به هەسکە هەسك بە دوایدا
ڕایاندەکرد
وەك هەرا و ورتە ورتی
هاتنی کەژاوەی پادشاکان.
ئەوەی کە ڕۆشت
ڕۆشت و گوزەری کرد
ئێستاش ..هیچ شتێك نەماوەتەوە
جگە لە غەم و یادگارییەکان.
بە باڵە ماندووەکانی
گەردو خۆڵی گسك دەدا
لە ژێر گوڵە بەیبونێکی وەریودا
وەکو دزێك.... ڕۆنیشتبوو
وەك ئەوەی بزانێ باهۆزێك بەڕێوەیە ......و
ددانە ڕەشەکانی تۆزێکی تر دەردەکەون و
چوون کەشتی و بڵێسەی شۆڕشەکان
دەبریسکێنەوە...
بەم هەموو لاوازی و پەرپووتییەوە

سوور بوو لە هەڵایسانی ئەم جەنگە...
بیابان... وشك و چۆڵەوانی بوو
جەنگ... بێ شاهید و هەلهەلە کێشان بوو
تا نیوەی ڕۆژ چاوەڕوانی کێشا...و
هێدی... هێدی
بە چۆکدا دەهات
چوون ڕەوەندێکی سەر سەختە ڕێگەیەك...
چرنووکەکانی وەك حەڵوایەکی هەرزان
بەسەر لمەکاندا
دەڕژا...
شنەبایەکی فێنکی وەك کانی
هەڵیکرد بە سەریا
ئاهێکی هەڵکێشا و پێی مەست بوو
وەکو گەنجێك ژنێکی لاقە کردبێ
دووبارە ڕاکشایەوە
لە ژێر هەتاوێکی سوتێنەر ....و
تەنهاییەکی درێژی وەك زەمەن
لە ناکاو ئاسۆ تاریك داهات و
بەیبوونەکان لار بوونەوە
هەڵۆ....کلکی شەلاڵی بە عارەقە و خوێنەوە هەڵبڕی....و
مێشوولە شاراوەکانی نێو زامەکانی دەرپەڕین
دەسووڕایەوە و باکی بە هیچ نەبوو
لە خۆشیدا دڵی هەڵدەپەڕی....و
لێرە و لەوێ هەڵدەبەزی
وەکو بەرخێك بۆ بینیی دایکی ڕابکا ...کاتێ لە لەوەڕ دێتەوە

من بینیم :
وەکو سەماکەرێکی سەر بەفر ..خێرا دەسوڕایەوە
شەمەندەفەرێکی بەهێزتر بوو لە لێدان
بۆ یەکەمجار ناخی زەوی هەڵدەکۆڵی
تا سوود لە هەر دەنکە لمێك و هەر چڕنوکێکی
ببینێ ...و
لە جەنگەکە بە سەربەرزی بێتە دەرێ
گێژەڵووکە.........
وەك زیخ .....وەك مۆسیقای سەرکەوتنە
جارێك دێت و ئیتر نایبینیتەوە
هەڵۆش ....بەبێ لوتکە و بە بێ باهۆز
لە بووکێکی بێ ملوانکە و بێ فرمێسك دەچێ .
وەکو ڕاوچی پەپوولەکان...دەنووکەکانی کردەوە
بە وریایی و بەڕێزەوە هەنگاوی بۆ دواوە هەڵهێنا
چوون قوتابییەکی بەردەم مامۆستا کۆنەکەی ...و
دەنووکی لە باهۆز .....
لە خۆڵ....لە خوێن .....لە شانۆکان ...
لە ماچە ترساوەکان ....و
ئەو مستیلانەی شیعری سەلامیاتی لە سەرە...لە هیچێتی
وەردەدا..
وەکو تەشی ...و لە ناوەندی تاڵێکی بچڕاو دا
دەخولایەوە....و
هاوارە بڵندەکانی وەك دەنگی گوللە
پارچەیەك خوێن و مەزنیی بوون
لە پشت کورسی بیابانەوە

وانەی
هونەری تینوێتی و بڕینی پەیوەندی یەکانی
دەوتەوە...
لە بارەی ئەو خەونەی لە نیوەڕۆیەکدا
دێت ...
خەونێک.....خنکێنەر و بەسۆز وەکو ماچ.
ئێستا...
کاتی ئەوەیە جوانترین دیل لە مێژوودا
لە دەرەوەی قەفەزەکەیدا
سوژنە سوورەکانی خۆی بخواتەوە...
پەیژە لەسەر شانی باهۆز دانێ
وەک باخەوان بەری خەمەکانی لێکاتەوە
بەڵام باهۆز...
چوون سەماکارێکی ڕۆژهەڵاتی
شانەکانی دەلەرزاند
وەک سۆزانییەکی شارەزا
لەبەردەم گەنجێکی تامەزرۆ دا
خۆی دوور دەگرت...
تا ئەگەر بۆی لوا
دەرگاکانی ئاسۆی لێبکرێتەوە.
کە پشتی لێکرد
هەڵکە شێتتر بوو
وەک پشیلە قاچی بە زەویدا دەکوتا
وەک منداڵێکی ترساو .....
بیەوێ بە کیلۆنی دەرگاکە ڕابگا

هەموو شتێك لەبەرچاویدا ...
لار دەبوەوە
هەتاو و خۆڵ و برینەکان
ئاسۆی لاتەنیشتی
چۆڵ و قێزەون دەبوو
وەك منالْدانی دوای لەدایکبوونێك
بە کەف و چەورییەکانی وە دوای دەکەوت
وەك مەستێك ...
کە بیەوێ بچێتە ژووری ئاوازەکانەوە
پاش ئەوەی سەدان جار کرابێتە دەرەوە
بەلاّم ...بێ سوود بوو
ئیتر باهۆز پەردەکانی دادایەوە ....و
دۆسیەی میوانەکانی داخست ...
و هەلْۆ پیرەکەش بەکوڵ دەگریا...و
چرنووکەکانی چوون دەستی پاڕانەوە
بەرز دەکردەوە...و
وەکو مندالْ دەیزریکاند.
پاش هەزاران میل.....و
پاش هەموو ئەو ستەم و لە خۆباییبوونەی
باهۆزەکە لەسەر کەناری دەریایەك
نیشتەوە...و
ڕووخساری....
چوون ڕووخساری زۆرانگێك
تێکشکاو...
سنگی ... چۆڵ چۆڵ بوو...

له مه‌مك و میدالیاكان
بووكه‌كانی ....له مستیله و ئاوێنه‌كان
دابڕان.....و
وه‌ك مه‌ستی به‌رده‌م ده‌ستشۆرێك
پاڵكه‌وت به‌سه‌ر به‌رده‌كانه‌وه...
له ناخی دڵیدا ئازارێكی جه‌رگبڕ و ...
په‌نجه‌ی چكۆله و هاواری به‌تین
هه‌بوون....
وه‌ك مێرووله..له كونی لووت و گوێ و قوڕگه‌وه
ئاوی هه‌ڵده‌گۆزی...
وه‌كو قه‌ره‌ج هه‌ڵده‌په‌ڕی..
له‌سه‌ر پشتی كۆماوه .....و
ترسناكی وه‌كو پرد
ئه‌م ئازاره له كوێوه هه‌ڵده‌قوڵێ؟
ئه‌م لێدانه بڵیسه‌دارانه‌ی وه‌ك ئاگری زه‌ماوه‌نده‌كان
كێ ئه‌م كه‌فه‌ڵه به‌ربه‌ری یه‌ی
به‌م برینه زۆر و ته‌ڕانه‌ی چوون برژانگی عاشق
داپۆشی؟
كاتێك چوون تاوانبارێك كه‌وتبووه سه‌رچۆك
وه‌ك ئه‌وه‌ی شتێك بدركێنێ
بیری كه‌وته‌وه ...
شتێكی زۆر دێرین
بۆ ئه‌م برین و ئازارانه
وه‌ك خه‌زێنه‌یه‌ك ناخی هه‌ڵده‌كۆڵێ...
شتێكی چكۆله‌ی وه‌ك مێشووله

هەتا مردن.....خەباتی کرد...... و
تێکۆشا.....
پێدەچێ ..
هەموو ئەو ئازارە جەرگبڕانە
ئەو پەڕ و هەوارە لەدوایٚ یەکانەی.....
سەر لێوی برینەکان
لەو شتە چکۆلەیەوە هاتبێ ...
باهۆزەکە ....بە باڵای خۆی
چوون چادرێکی گەورەی وەك جیهان...
لێی کەوت.....و
ئیتر وەك دەسماڵێك
بچووك .....بچووك بوویەوە و
مرد.....و
ئەسرینەکانی لە شێوەی هەڵۆیەکدا
دادەباری.

پەراوێز :
(١) شێوار: دەست شۆر، مغسلە
(١) ئاوێت:مەرەکەب، حبر